د. سەلاحەدین ڕاستگەلدی

# شەڕە لەبیرکراوەکە

فارسی بۆ کوردی: کاوە نەبی

# شەڕە لەبیرکراوەکە

## ڕاپۆرتێک لە کوردستانەوە

نووسینی: د. سەلاحەدین ڕاستگەلدی

وەرگێڕانی: کاوە ئەمین

ناوی کتێب: شەڕە لەبیرکراوەکە- ڕاپۆرتێک لە کوردستانەوە
دانانی: د. سەلاحەدین ڕاستگەلدی
گۆڕینی بۆ کوردی: کاوە ئەمین
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٠٩
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: هەندرێن شێرزاد
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٥٧)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە:

- یادی سەرۆک مستەفا بارزانی و یاوەرەکانی لە کاروانە پرشکۆکەیان بۆ سۆڤیەت.

- یادی هەموو قوربانیەکانی شۆڕشی ئەیلولی مەزن، لە نێویاندا باوکم شەهید حەمەئەمین گوڵچین کە لە ١٦ نابی ١٩٧٤دا لە چیای گۆڕەز لە شەڕی داگیرکەرانی عێراقیدا گیانی لە دەست دا.

- بەدایکی خۆشەویستم کە هەموو ژیانی پێشکەشی ئێمە کرد.

## چەند پەیڤێک

ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٦٧دا لە گەرمەی شۆڕشی ئەیلولدا بەزمانی سوێدی بڵاوکراوەتەوە، بۆ ئەوەی کێشە و تراژیدیای کورد لە باشووری کوردستاندا بخرێتە پێش چاوی خەڵکی سوێد و دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە. کتێبەکە لە شێوەی ڕیپۆرتاژێکی دوورودرێژدا نووسراوە و گەلێک زانیاری بەنرخی تێدایە کە بۆ خوێنەری کورد، بەتایبەتی ئەوانەی بیانەوێت لەسەر شۆڕشی ئەیلول لێکۆڵینەوە بکەن، بەسوود دەبێت.

شۆڕشی ئەیلول لاپەڕەیەکی گرنگی مێژووی مۆدێرنی کوردە، کە دەکرێت سەدان وتار و کتێب و تێزی ئەکادیمیی لەسەر بنووسرێت. چونکە لە شۆڕشی ئەیلولدا بەتایبەتی دوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠، گەلی کورد بەهەموو چین و توێژەکانییەوە لەدەوری شۆڕشی ئەیلول و سەرکردەی شۆڕشەکە مستەفا بارزانی نەمر کۆبووبوونەوە.

لەم کتێبەدا نووسەر کە بۆخۆی کوردێکی باکووری کوردستانە، ڕاستگۆیانە باسی ڕووداو و تاوانەکانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقی دەکات دژ بەگەلی کورد. ئەم کتێبە دەیان دیکۆمێنتی گرنگ لەخۆ دەگرێت، لە ناوی ئەو گوندانەوە بگرە کە لەلایەن سوپای عێراقییەوە سوتێنراون هەتا دەگاتە گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرپرسانی شۆڕش بەتایبەتی بارزانی نەمر و، زیندانییە سیاسییەکانی کورد لە گرتوخانەکانی عێراقدا، لەگەڵ دەیان وێنەی بەنرخ.

پێویستە ئەوەش بڵێیم کە نووسەر لە نووسینی ناوی گوندەکان و ئەو مرۆڤانەی کە ناویان هاتووە لەم ڕیپۆرتاژەدا، ڕەچاوی زمانی سوێدی کردووە، ڕەنگە لە نووسینەوەی ناوەکان بەکوردی هەڵە کرابێت، بۆیە لە ئێستاوە داوای لێبووردن لەوانە دەکەم کە ناوەکانیان بەدروستی نەنووسرابێت، بەتایبەتی ناوی گوندەکان، ئەگەر خێرەومەندێک لە

شوێنێکدا ناوی گوندێکی بەهەڵە بینی و لە ڕاستییەکەی ئاگادارمان بکات، پێشەکی سوپاسی دەکەم.

نووسەر ناوی کۆمەڵێک سەرچاوەی نووسیوە لە کۆتایی کتێبەکەدا کە لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەدا بەکاری نەهێناون، منیش بەپێویستم نەزانی جارێکی تر بیاننووسمەوە. دەبێت ئەوەش دەستنیشان بکەم کە لێرە و لەوێ هەندێک جار پەرەگرافێک یانیش دێڕێکم پەڕاندبێ، بەبێ ئەوەی هیچ لە ناوەڕۆکی باسەکە بگۆڕێت. هەروەها لە جیاتی دەستەواژەی "باکووری عێراق" باشووری کوردستانم بەکارهێناوە.

سوپاسی هەمموو ئەوانە دەکەم کە لەم کارەدا هاوکاریان کردووم، بەتایبەت کاک هاوڕێ باخەوان و کاک ئاکۆ محەممەد و هاوسەرەکەم تارا خان.

وەرگێڕ
kawa-amin@hotmail.com

## پێشەکیی چاپی سوێدی

کێشەی تراژیدیای نێوان کورد و عەرەب لە کوردستان (مەبەست باشووری کوردستانە)، بەپێچەوانەی بۆ نموونە باشووری ئەفریقا، رۆدیسا و ڤێتنام، سەرنجی دنیای بۆ لا رانەکێشراوە.

بۆیە ئێمە کۆمیتەیەکی کوردی سوێدیمان دامەزراندووە بەو مەبەستەی کە بتوانین سەرنجی خەڵک و تێگەیشتنیان بۆ رەوشی کورد رابکێشین.

بۆ ئەو مەبەستەش دوو رێگامان هەڵبژاردووە. یەکەمیان بڵاوکردنەوەی زانیاری لەسەر کورد و دووەمیش بەشێوەیەکی کرداری بتوانین هاوکاری مرۆڤانە بگەیەنین بەکورد. دەبێت هەرچی زووترە شەڕی ماڵوێرانکەرانەی دژ بەکورد رابگیرێت. هێزەکانی عێراقی تاکتیکی تەخت کردن لەگەڵ خاکدا، پیادە دەکەن و، بەزانایییەوە گوندە کوردیەکان یەک لە دوای یەک دەسوتێنن، کە لە ئەنجامیشدا خەڵکی مەدەنی کورد رووبەرووی دژواری دەبنەوە.

دوای ئەوەی کە زانیاری بێلایەنەمان کۆکردۆتەوە، کۆمیتەی کوردی هاتۆتە ئەو بڕوایەی کە پاکتاوی رەگەزی بەو شێوەیەی کە لە پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکاندا پێناسەکراوە لە کوردستاندا پیادە دەکرێت.

ژمارەیەکی زۆر رێکخراوی گەورەی سوێدی پشتیوانی کارەکانمان دەکەن. هەروەها هەندێک هەنگاومان ناوە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی سوێد و خاچی سووری سوێدی لە پەیوەندی لەگەڵ رەوشی کورددا.

بەخۆشحاڵییەوە ژمارەیەکی زۆر هاوولاتی سوێدی سەر بەپارتە جیاوازەکان و ئیدیۆلۆژیەکان ئامادەیی خۆیان بۆ پشتیوانی لە کارەکانمان نیشان داوە.

کۆمیتەکەمان داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان و خاچی سووری

نێودەوڵەتی کردووە کە لە پلەی یەکەمدا چاودێر بنێرن بۆ ئەو ناوچانەی کە شەڕیان تێدایە، تا بتوانن بەچاوی خۆیان ڕەوشی ناوچەکە ببینن.

هەروەها کۆمیتەکە داوای لەو ڕێکخراوانە کردووە کە چالاکانە پێداویستی و هاوکاری بۆ ئەو ناوچانە بنێرن بۆ ئەوەی هاوکاری ژن و پیر و پەککەوتووەکان و منداڵان بکەن. ئەو یارمەتیانە، خواردن، جلوبەرگ و دەرمان و چادر و شتی لەو بابەتە لە خۆ بگرێت.

دوای ئەوە کۆمیتەکەمان بڕیاری دا کە چاودێری سەر بەکۆمیتەکەمان سەردانی ناوچەکە بکات. چاودێرەکە سەردانی کوردستان بکات بەمەبەستی ئەوەی کە لە نزیکەوە بەشێوەیەکی بێلایەنانە بتوانێت لەسەر ڕەوشی خەڵکی مەدەنی کورد لێکۆڵینەوە بکات و لە ڕاستی و دروستی ئەو هەواڵانەی لەمەڕ ئەشکەنجە بەدژی زیندانیانی کورد بکۆڵێتەوە. لە کۆتایشدا پێشنیازی بەجێ بەکۆمیتەکە بدرێت کە ئایا بەچ جۆرێک بتوانێت هاوکاری مرۆڤانە بگەیەنێتە خەڵکی کورد. بۆیە بڕیارمان دا کە دوکتۆری دەرمان، سەلاحەدین ڕاستگەلدی بنێرین بۆ ناوچەکە بۆ ئەوەی بتوانێت زانیاری پێویست بەدەست بخات.

دوای ئەوەی کە کۆمیتەکە لە ڕاپۆرتەکەی دوکتۆر ڕاستگەلدی کۆڵییەوە، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە بخاتە بەردەمی کۆمەڵگای سوێدی کە بەچاوێکی پۆزەتیڤەوە لە کارەکانی ئێمە دەڕوانن. بۆیە پێشنیازی چاپکردنی ڕاپۆرتەکەمان بەستیفتلسەی کلتوور وناتور کرد، کە بەشێک لە کارەکانیان بریتییە لە «دژایەتی بیرە تۆتالیتاریە دەوڵەتیەکان و، هەروەها دەستەبەرکردنی ئازادی سیاسی و ئابووری». ئەوانیش پێشنیازەکەیان قبووڵ کرد و بڕیاریان دا کە پارەی زیادەی کتێبەکە بدرێت بەکۆمیتەی کوردی بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی.

بە هیوای ئەوەین کە ئەم ڕاپۆرتەی لەسەر کوردستان بگاتە بەشێکی

گەورەی کۆمەڵگاکەمان و ، ئەوانیش بەشێوەیەکی چالاکانە و هاوکارانە بۆ سەرنج ڕاکێشانی کۆمەڵگا بۆ سەر ڕەوشی نالەباری کورد تێ بکۆشن، بەڵکو ئەمە خوایە ، کۆتایی بەترلژدیای ئەو گەلە بێت.

*مێرتا هانسۆن - سەرۆک، ئۆلف گ. تاندبیرکی جێگر*

*یان. ئا . نوردلاندر - سکرتێرە*

## لەلای بەرپرسی پاراستنی سنووری کوردی

لە ئێوارەی ١٨ ئابی ١٩٦٦دا، پێش ئەوەی تاریکی شەو فرسەت بهێنێ، بەدزییەوە سنووری کوردستانی عێراقم بڕی. ناوی ڕێگاکە و ئەو هاوڕێیانەی کە لە ڕاستیدا منیان بەقاچاخی برد بۆ ناو کوردستان، نهێنییەکە، ئەم نهێنییە دەپارێزم، هەتا ئەو کاتەی ئاشتی لە ناوچەکەدا بەرقەرار دەبێت.

لە سەرەتادا، خۆم وەکو کوڕە مەکتەبلییەک دەبینییەوە کە تازە لە قوتابخانەیەکی نوێدا دەست بەخوێندن بکات. لە هەرچوار لامەوە دەموچاوەکان نوێ و نەناسراو بوون، کە بەچاوێکی گومانا وییەوە تێیان دەڕوانیم. چەندین دەقیقەی دوور و درێژ و دژوار چاوەڕێم کرد هەتا دوو قسەمان گۆڕییەوە.

لە ڕاستیدا، یازدە ڕۆژ بەناو ڕێگا نهێنییەکاندا ڕێگام بڕی تا گەیشتمە کوردستان. بەڵام هێشتا زۆرم مابوو تا بگەمە شوێنی مەبەست. دوو ڕێگام لەبەردا بوو کە هەڵیبژێرم. یان ئەوەتا دەبێت بەشێوەیەک ڕێگایەک بدۆزمەوە تا خۆم بگەیەنمە بارەگای ژەنەراڵ بارزانی، یاخود دەبێت خۆم بگەیەنمە لای بیرۆی ڕاپەڕاندنی شورای شۆڕشی کورد، بۆ ئەوەی مۆڵەتیان لێ وەربگرم تا لەسەر ڕەوشی ژیانی خەڵکی سڤیلی کورد لێکۆڵینەوە بکەم.

بەرپرسی پارێزەری سنوور لای خۆی هێشتمیەوە بەو مەبەستەی کە لە نزیکترین فرسەتدا ڕەوانەی لای ژەنەراڵ بارزانیم بکات. بانگی کرد کە کوتە کاغەزێکی بۆ بێنن، لەبەر ڕووناکی لۆکسەکەدا چەند دێرێکی دەربارەی کۆمیتەی سویدی-کوردی و مەبەستیان لە ناردنی چاودێرێکیان بۆ کوردستانی عێراق، نووسی. کاغەزەکەی نووشتانەوە بەشێوەیەک کە لە زەرفێکی بچووکدا جێگای ببێتەوە و چەند دێرێکی لەسەر بەرگی زەرفەکە

نووسی و دای بەپێشمەرگەیەک کە کلاشینکۆفێکی ڕووسی و سێ دانە شانەی پڕ لە فیشەکی لە خۆی بەستبوو. پاشان خانەخوێکەم ڕووی دەمی کردە من و وتی: ئێمە لە ژەنەراڵ بارزانی دەپرسین کە ئاخۆ وەختی هەیە لەم چەند ڕۆژەدا بتانبینێ. پێم وابوو کە نامەبەرێک نامەکە دەبات بۆ بارەگـــای بارزانی و، دەبێت چەندین ڕۆژی نادیار چاوەڕێ بکات بۆ وەڵامەکەی جا بەئەرێیی بێت یان نەخێر. ناخۆشترین شت ئەوە بوو کە من بەدەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە.

پێش ئەوەی کابرای نامەبەر بگەڕێتەوە، دەعوەتی چاخواردنەوەیان کردم و نزیکەی نیو سەعاتێک قسەمان کرد، پێشمەرگەکە گەڕایەوە و نامەیەکی پێچراوەیی لە شێوەی ئەو نامەیەی کە لەگەڵ خۆی بردبووی هێنایەوە و دایە دەست خانەخوێکەم. نامەکەی کردەوە و پاش ئەوەی خوێندیەوە پێی ڕاگەیاندم کە ڕەنگە لەم ڕۆژانەدا ژەنەراڵ بارزانی بتوانێت بتبینێت. ئەو وەڵامە خێرایە وای لێکردم کە بڕوابکەم کە من لە نزیک بارەگای ژەنەراڵ بارزانیم. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە نامەکە لە ڕێگای تەلەگرافەوە نێردرابوو، وەڵامەکەشی هەر بەو شێوەیە وەرگیرابووەوە.

خانەخوێکەم وای پێ باش بوو کە بەشەو بەڕێکەوم، ئەمەش بەو مانایە بوو کە دەمتوانی هەر ئەو شەوە بڕۆم، یانیش چاوەڕێ بکەم تا شەوی داهاتوو، ئەگەر پێویستیم بەئیسراحەت کردنێک بێت. لە ڕاستیدا پێویستیم بەوە هەبوو کە ئیسراحەتێک بکەم، بەڵام نەمدەویست بیست و چوار سەعات کات لەدەست بدەم. چاکتریش وابوو کە هەر بەردەوام بم لە ڕۆیشتن، هەتا لەشم داهێزرا بوو.

ئەسپێکیان بۆ هێنام و دوو ڕێگا نیشاندەریشیان لەگەڵ ناردم کە بەپیادە دەڕۆیشتن. یەکێک لەوان لە پێشەوە دەڕۆیشت و ئەسپەکەش بەو تاریکەشەوە بەدوایدا دەڕۆیشت. ئەوان هەندێک جار یارمەتی ئەسپەکەیان دەدا و ناچاریان دەکرد بەڕێگا سەخت و دژوارەکاندا بڕوات. تارادەیەک سەفەرەکەمان زۆری خایاند و، چەندین کاتژمێر ڕێگامان لە تاریکی شەودا بڕی، هەتا لە دوورەوە تارمایی چەند خێمەیەکم بەدی کرد کە لۆکسیان تیادا هەڵکرابوو. بەتەنیشت ڕەشماڵێکی کوردەواریدا ڕەتبووین، کە بەمەزندە جێگای چل پێشمەرگەیەکی تێدا دەبووەوە. دانیشتبوون و خەریکی چا خواردنەوە و، گوێ لە ڕادیۆ گرتن بوون. دوو سەد مەترێک دوای ئەو خێوەتە پێیان وتم کە دابەزم. ئەسپەکەیان برد و منیشیان برد بۆ ناو خێمەیەکی بچکۆلە. سێ کەس لەناو خێمەکەدا دانیشتبوون کە لەدواییدا بۆم دەرکەوت کە خەڵکانی نزیک بەڕێزەنەراڵ بارزانی بوون. ئەوانیش سەلیم ئەسعەد خۆشەویی کوڕی بەرپرسی بەشی باکوری سوپای شۆڕشگێڕی کورد و، سەرلەشکر نوعمان عیسا و سەرلەشکر عەلی هالۆ، کە لە کۆتایی ئەم نووسینەدا زیاتر لە گەڵی ئاشنا دەبین.

پێش ئەوەی ئەو جێگا تەنگەبەرە بکرێت بەجێگای خەو، چوار دۆشەکیان لە تەنیشت یەکەوە ڕاخست، نان و چایان بۆ هێنام. بیجامەکانم لەبەر کرد و، کامێرا و جانتاکەم لە پشت سەری خۆمەوە دانا. هیوای ئەوەم دەخواست کە هیچ کام لەو هاوڕێیانەی کە لە خێمەکدا دەخەوتن، دەست نەکەن بەپرخە پرخ کردن، هەتا بێدەنگی خێمەکە دابگرێ و خۆیشم خەوم لێ بکەوێت. ئەوە بوو کۆتاییم بەو بەشەی سەفەرەکەم هێنا کە تارادەیەک سەخت بوو.

دوا بیرکردنەوەم پێش ئەوەی چاوم بچێتە خەو ئەوە بوو، کە ڕێگا بەکۆمیتەی سوێدی-کوردی بدرێت کە بەشێوەیەکی بێلایەنانە

لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەسەر ئازار و مەینەتیەکانی خەڵکی سڤیلی کورد بەئەنجام بگەیەنێ. ئێستا من خەریک بوو بەئامانجەکەم دەگەیشتم. تۆ بڵێی مۆڵەتم بدەنێ؟ لە خێوەتگای شەڕی کورداندا ئەو شەوە بەچاکی خەوتم. ئەگەر ئەو شەوەش کەسێک پرخەپرخی کردبێت ئەوا ڕەنگە میوانە لە دوورهاتووەکەی باکوور (سوێد) بووبێت. ڕۆژی دوایی کە هەینی بوو، ڕێکەوتی ١٩ی ئاب، کاتژمێری حەوتی بەیانی خەبەرم بووەوە، هاوڕێکانی ناوخێمەکەم لەبەر ڕووناکایی ڕۆژدا، بینی. ڕۆشتمە دەرەوە، بەناوی سازگاری ئەو جۆگە بچکۆلەیەی کە بەناو خێوەتگاکەدا دەهاتەخوارەوە، دەم و چاوم شت. پێشمەرگەیەکی کورتە باڵا کە ئەو سێ ساڵەی ئەخیری ژیانی لە نزیک ژەنەراڵ بارزانیدا بردبووە سەر، کاری ئەوە بوو، خزمەتی ئەو دوو خێمەیە بکات کە بۆ جێگای حەسانەوەی میوانەکانی ژەنەراڵ بارزانی دانرابوون. پێش ئەوەی کاکی پێشمەرگە لەگەڵ خۆی بمبات بۆ ئەو خێمەیەی کە جێگای خواردنی نانی بەیانی بوو لەگەڵ میوانەکانی تردا، ئاوی گەرمی بۆ هێنام بۆ ڕیش تاشین.

یەکێک لەوانەی لە کاتی نانخواردنەکەدا بینیم، سەرلەشکرێکی کورد بوو بەناوی نووری مەعروف، لە ناو سوپای عێراقیدا بووبوو، هەم هاوپۆل و هەمیش برادەری شەخسی سەرۆک وەزیرانی ئێستای عێراق، ناجی تالیب بوو. سەرلەشکر مەعروف، یەکێک بوو لە گەورە بەرپرسانی بەرجەستەی کورد کە هەموو دەسەڵاتێکی فەرمی لێ سەندرابووەوە لە عێراق. پەیوەندی کردبوو بەسوپای شۆڕشگێری کوردەوە، بەپلەی یەکەم بۆ پاراستنی گیانی خۆی. ئەو لەناو سوپای شۆڕشگێری کورد ئەفسەرێکی ڕێزلێنراو و ڕاوێژکار بوو لەناو سوپادا.

لەکاتی نانخواردندا، سەرداری حەمەد ئاغا کە یاریدەری ژەنەراڵ بارزانی بوو، باسی ئەوەی کرد کە پێش نیوەڕۆ چاوەڕوان دەکرێت ژەنەراڵ بارزانی بێت بۆ یەکێک لەو دوو خێمەیەی کە لە شێوەی سالۆنی پێشوازیکردن دەچوون. دوایی زانیمان کە ژەنەراڵ بارزانی، شەوی ڕابردوو تا

درەنگانێک سەرگەرمی کارەکانی بووە، بۆیە دیدارەکەی دواخستبوو بۆ کاتژمێری چواری پاش نیوەڕۆ.

دوای نانخواردن چووینە دەرەوە، ژینگە شاهانەکەی کە چواردەوری خێوەتگاکەی دابوو، سەرنجیان بۆ لای خۆی ڕاکێشام. ئێمە نزیک چیای هەڵگورد بووین کە بەرزترین چیای کوردستانی عێراقە. خێوەتگاکە لە بەرزایی ۲۵۰۰ مەتردا هەڵدرابوو، دیمەنێکی ئەفسانەییمان لێوە دیاربوو کە بەسەر دۆڵەکەدا دەیڕوانی و بەرەو حاجی ئۆمەران درێژ بووبووەوە. لە هەمان ئاستدا لە ڕۆژهەڵاتی خێوەتگاکەوە، دەشتاییەکی سەوزی جوانی لێ بوو، چەندین ڕەشماڵی کۆچەری لێ هەڵدرابوو، مەڕ و بزنەکان بەئاسوودەییەوە تێیدا دەلەوەڕان. لەو دۆڵە باریک و پێچاوپێچەی حاجی ئۆمەراندا، ژمارەیەکی لەڕادەبەدەر دار چنار ڕوێنرابوون. لەو خوارەوە لەناو دۆڵەکەدا ڕووبارە سەرخۆشەکە دەدرەوشایەوە، کە هەزاران ساڵە بەهەمان تاقەتەوە دڵی زەوی قوڵتر دڕەدات و ڕێگای خۆی دەبڕی و هاژە هاژی بوو. ناوچەیەک کە هەناسەی ئازادی دەدا و ئارامی گوندەکانە. وڵاتێک کە دەبوو ئاشتی تێدا بەرقەراربووایە. لە نزیک ئەو خێمەیەی کە شەوی ڕابردوو تێیدا مابوومەوە، سەرلەشکر عەلی هالۆم بینی و لێم پرسی کە ئاخۆ دەتوانین دەمەتەقێیەک بکەین.

پێکەوە سەربەرەوخوار بەپێچاوپێچ بەرەو ڕووبارەکە چووینە خوارەوە. لە قابلەمەیەکی مسینی گەورە نزیک بووینەوە کە ئاگری لە ژێردابوو و پڕبوو لە ئاوی گەرم. عەلی هالۆ زۆر میهرەبانانە ڕووی تێکردم وتی: دوکتۆر ببوورە من دەبێت جلەکانم بشۆم. دەستی برد جامانەکەی کردەوە و ئاوی کردە ناو تەشتێکی بچکۆلەوە و دەستی کرد بەشتنی جامانەکەی و درێژەی بەقسەکانی دا: هیچ کاتێک ئێمە ڕێگا نادەین پێشمەرگەکانی بەردەستمان کاری شەخسیمان بۆ بکەن. خۆ ئەگەر خۆشیان بیانەوێت جلەکانم بۆ بشۆن ئەوا خۆم ڕێگایان پێ نادەم. هانیان دەدەم، هەمان کات جەزاشیان دەدەم، ئەگەر پێویست بکات، بەڵام هیچ کاتێک ڕێگای

ئەوەیان نادەم هیچ خزمەتێکی شەخسیم بۆ بکەن.

لێم پرسی سزاکەیان چییە؟ دەست بەجێ وەڵامی دایەوە: بۆ ماوەیەکی دیاریکراو چەکیان دەکەم. ئێمە دەزانین کە ئەمە سەختترین حوکمە بۆ پێشمەرگەیەک. سەرلەشکر چەند جارێک جامانەکەی بەئاودا دا و گوشیی و هەڵیتەکاند و بەسەر دەوەنێکدا هەڵیخست تا وشک بێتەوە. جلەکانی تریشی داکەند و بەردەوام بوو لە جل شتن، تەنها دەرپێیەکی کورتی لە بەردا مابوو، منیش بەئەسپایی بەجێم هێشت، چونکە لەو باوەڕەدابووم کە سەرلەشکر هەموو جلەکانی بشوات پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بارەگاکە. پێ دەچوو کە ئەو هەر ئەو جلانەی بەری شک بەرێت، هیچ نەبێت لەو کاتەدا.

بەدرێژایی چەمی حاجی ئۆمەران، چەند جارێکی تریش جل شتنی سادە و بەخێرایی لەو جۆرەم بینی، کە کاریگەریان کەم بوو. چەندین دەستە پێشمەرگەم بینی کە جلەکانیان دەشت و بەدوایدا دەستیان دەکرد بەمەلەکردن و لەناو ئەو ئاوە ساردەی رووبارەکەدا و کەیفیان دەکرد، هەتا جلەکانیان لەبەر ئەو خۆرە گەرمەدا وشک دەبوونەوە، کە بەسەر دەوەن و تاشەبەردەکاندا هەڵیان دەخستن.

بە دڵنیاییەوە سوپای پێشمەرگەی کوردان دیموکراتیترین ڕێکخراوی سەربازیی جیهانن ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ جلەکانی بەریان ، پلە و پایە و (ڕوتبەی) سەربازی لە لەلای ئەوان وجوودی نییە. زۆربەی ئەوانەی کە لەناوچەیەکدان بەدەموچاو یەکتری دەناسن و کەس پێویستی بەوە نییە بەڕوتبەکەیەوە یاخود بەپلەی فەرماندەییەوە، خۆی بناسێنێ.

جلەکانی لەشکری پێشمەرگە، تێکەڵاوێکە لە جلوبەرگی سوپایی و جلوبەرگی کوردیدا. جامانەکانیان بەتەواوەتی کوردانەن. دەکرێت جۆری ڕەنگی جامانەکانیان تایبەت بێت بەناوچەیەکەوە، یاخود بەبنەماڵەکانیانەوە. لە ڕاستیدا دەتوانرێت وەکو عەشیرەتە

سکۆتلەندییەکان چاویان لێ بکرێت. بۆ نموونە بارزانی جامانەیەکی سوور لەسەر دەکات کە چوارگۆشەی وردی تێدایە، کەچی پێشمەرگەکانی ناوچەکانی خوارەوە جامانەی ڕەش لەسەر دەکەن. کراسەکانی بەریان هەر هەمان مۆدێلی کراسی ڕۆژئاوایین، بەڵام پشتێنەکانی پشتیان پێکهاتووە لە چەندین مەتر قوماشی باریک، کە قەف قەف لە کەمەریانەوەی دەئاڵێنن. هەر پێشمەرگەیەک بەئارەزووی دڵی خۆی جۆری پشتێنەکەی هەڵدەبژێرێت، کە نەخشێکی جوان و قەشەنگی لەسەر کەمەریان نەخشاندووە. بەشێک لە پێشمەرگەکان شاڵ لەبەردەکەن کە مۆدەیەکی کوردییە و سەدان ساڵە هەیە. جلوبەرگی کوردی بۆ لەبەرکردن زۆر ڕاحەت و لەبارە. پێشمەرگە لە هاویناندا زیاتر کڵاش لە پێ دەکەن کە جۆرە پێڵاوێکی خۆماڵییە.

لەکاتی گەڕانەوەمدا بۆ لای بارەگاکە، ڕێگاکەم هەڵەکردبوو و خۆم لە بەرزاییەکی پشت بارەگاکەوە بینییەوە. لە ناکاو دوو پێشمەرگەی چەکدارم بینی کە بەڕاکردن بەرەورووم دەهاتن، منیش دەستبەجێ لە جێگای خۆمدا ڕاوەستام، هەتا گەیشتنە لام و لێیان پرسیم تۆ لەگەڵ کێ دای؟ منیش پێم وتن کێم و داوام لێکردن کە ڕێگای ئەو خێمەیەم نیشان بدەن کە دوێنێ شەو تێیدا مابوومەوە. کەمێک پێش نانخواردنی نیوەڕۆ عەلی هالۆ و بەرپرسە گەورەکانی تر لە خێمەکەی تردا کۆبوونەوە. بەرپرسی کاروباری سەربازی ژەنەراڵ بارزانی ئاگاداری کردینەوە کە ژەنەراڵ بارزانی بڕیاری داوە کاتژمێری چواری دوای نیوەڕۆ بێتە ئێرە و لەگەڵ میوانەکانیدا دانیشتن بکات.

من دەمزانی کە بارزانی هەندێک عادەتی تایبەت بەخۆی هەیە و جێگای جۆراوجۆری هەیە بۆ حەسانەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە هەم خۆی و هەمیش دەوروبەرەکەی لە بۆردومانی فڕۆکە و ئیحتیمالی تەقینەوە بپارێزێ. وەک دەڵێن ئەو لە سێ شەو زیاتر لە شوێنێکدا ناخەوێت. ئێستا هەموو دەمانزانی کە ژەنەراڵ بارزانی لەو نزیکانەیە، بەڵام هیچ کەسێک

ئەیدەتوانی دەستنیشانی بکات لەچ شوێنێکە و بڵێ: ئەوە جێگای ژیانی بارزانییە. نزیک کاتژمێری سێ بوو یەکێک لەکوڕەکانی بارزانی هات بۆ لام لە خێمەکەمدا و زۆر بەڕێزەوە چارەکە سەعاتێک لەگەڵم قسەی کرد، ئەویش سابیر بارزانی، پێنجەمین کوڕی بارزانی بوو.

سەعات خۆی لە چوار نزیک دەکردەوە، نیتر بەئاشکرا دیاربوو کە ئامادەکاری بۆ بەخێرهاتنێکی شایستە دەکرا. ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگەی جامانە بەسەر و پشتێن لە پشت، لە نزیک ئەو خێمەیەی کە رێکوپێک کرابوو و پاک کرابووەوە بۆ بەخێرهێنانی میوان، بڵاوبووبوونەوە. بەئیحتیمالێکی زۆر ئەوان بۆ بینینی قارەمانی ئەفسانەیی خۆیان وەستابوون. بارزانی کەسێک نییە کە ژمارەیەکی زۆر پاسەوان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. دروست کاتژمێری چوار بوو کە ژەنەراڵ بارزانیم بینی لە بەرزاییەکی نزیک بارەگاکەوە بەدەرکەوت. تفەنگێکی کۆنی لە شاندابوو، پشتێنە قایشەکەی پشتی نیوەی دەمانچە و خەنجەرە گەورە دەسک ئاڵتوونیەکەی شاردبووەوە. بەتەنیا و بەهەنگاوی قایم لە شاخەکەوە بەرەوخوار دەهاتە خوارەوە، پێنج تا شەش مەترێکی مابوو بگاتە لای من کە منی بینی. هێشتا ئەو منی نەبینیبوو کە من فریای ئەوە کەوتم چەند وێنەیەکی بگرم، دوایی چاوی بەمن کەوت کە لە پشت خێمەکەوە وەستابووم و خەریکی کامێراکەم بووم. کەمێک بەسەرسوڕماویەوە هاتە پێشەوە لێم و تەوقەی لەگەڵ کردم. بەگرتنی دوو وێنەی تر لە نزیکەوە، کەمێکی تر سەروڵیم گرت و ئەویش زۆر میهرەبانانە وەستا تا من کۆتایم بەوێنەگرتنەکەم هێنا، دوای ئەوە بەرەو خێمەی تایبەتی میوان چووین.

پێش ئەوەی فەرمووی من بکات و لەلای دەستە ڕاستیەوە دانیشم، تفەنگە کۆنەکەی خۆی دا بەپێشمەرگەیەک. بۆ ئەوەی بەپێڵاوەوە بەسەر فەرشەکەدا نەڕوات، پێڵاوەکانی داکەند و لەپشت خۆیەوە دایان و دانیشت و پاڵی بەکوڵەکەی ناو خێمەکەوە دا. پێ دەچوو تەندروستی باش بێت و ڕیشی پاک تاشیبوو و سمێڵەکانی بریسکەیان دەهات. هەر ئێمە دانیشتین، بیست کەسێک خۆیان کرد بەژووردا و خێمەکە پڕبوو لەخەڵک. پاش کەمێک، ژەنەراڵ بارزانی لە حاڵ و ئەحواڵی یەکە یەکەیانی پرسی.

که نۆره گەیشته سەر من، پرسیاری لێ کردم که ئاخۆ کوردی دەزانم، منیش وتم بەڵێ. ژەنەراڵ بارزانی وتی " سوێدیەکان زۆرشت لەسەر کورد نازانن، چونکه سوێد وڵاتێکی زۆر دووره لێرەوه". منیش وەڵامم دایەوه که سوێدیەکان ئێستا کورد دەناسن و کۆمیتەی سوێدی - کوردی له ڕێگای چالاکیەکانی خۆیەوه کۆمەکیان کردووه بۆ ناساندنی کوردان. پاشان بارزانی چەند پرسیارێکی دەربارەی سیاسەتی سوێد لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا لێ کردم. منیش بۆم باس کرد که سوێد ماوەیەکی دوورودرێژه سیاسەتێکی بێلایەنانەی پیاده کردووه، گەلی سوێد ١٥٠ ساڵه له ئاگری شەڕ بەدوورن. پاشان بارزانی ڕووی دەمی کرده دانیشتووانەکه و وتی: "ئەوانەی خۆیان له شەڕدانەبووبن، یاخود بەچاوی خۆیان شەڕیان نەبینیبێ، ناتوانن هیچ کاتێک له ڕاستیەکانی شەڕ بگەن".
پاشان قسەکانی ستالینی بەبیر هێنایەوه که لەسەر جەنگی جیهانی دووەم وتبووی "ئەوانەی ستالینگرادیان نەبینیوه، ناتوانن له نەهامەتی و خراپەکاریەکانی شەڕ تێ بگەن".

پاش ئەوەی که چەند پرسیارێکی شەخسی له دانیشتووانەکه کرد، بەدووان له میوانەکانی وت که ئاخۆ پەلەیانه یان دەتوانن چاوەڕێ بکەن، بەدوو دڵیەوه وەڵامیان دایەوه. بێ ئەوەی لێیان بپرسێتەوه، ڕووی کرده من و وتی ئەی تۆ پەلەته؟ منیش دەست بەجێ وەڵامم دایەوه و وتم: بەڵێ زۆرم پەلەیه و پێویسته کارەکانم جێبەجێ بکەم و نابێت کات له دەست بدەم. بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوه، بارزانی هەستایه سەرپێ و پێڵاوەکانی هێنا، منیش هەلم قۆستەوه و پرسیارم لێ کرد که ئاخۆ دەتوانم چەند دەقیقەیەک بەتەنیا لەگەڵ ژەنەراڵ بارزانیدا دابنیشم. ئەویش سەری ڕەزامەندی ڕاوەشاند و، ئەوانەی که لەگەڵماندا بوون و گوێیان له داخوزیەکەی من بوو، خێمەکەیان بەجێ هێشت.

بارزانی جارێکی تر پێڵاوەکانی دانایەوه و لەسەر زەویەکه دانیشت و گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرت. باسی ئەوەم بۆ کرد که کۆمیتەکەمان بەنیازه

کێشەی کورد بخاتە بەردەم کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور. ئەوەشم پێ وت، کە کۆمیتەکەمان لەلایەن چەند ڕێکخراوێکی سویدیەوە پشتیوانی لێ دەکرێت، کە نوێنەرایەتی چەندین ملیۆن سویدی دەکەن. ئەوەی کە ئێستا کێماسییە و ڕێگرە لەبەردەم بەرفراوانکردنی چالاکیەکانمان ئەوەیە کە ئێمە بتوانین ڕاستەوخۆ وەکو شایەتێک باسی باروگوزەرانی خەڵکی سڤیلی کورد بکەین، لە کاتێکدا شەڕ هەر بەردەوامە. داوام لە ژەنەراڵ بارزانی کرد کە ڕێگام بدات لێکۆڵینەوە لەسەر باری ژیان و گوزەرانی خەڵکە سڤیلەکە بکەم و دڵنیام کرد کە کۆمیتەکەمان کۆمیتەیەکی سیاسی نییە و مەیلیشمان بەلای چالاکی سەربازی و بگرەوبەردەی سیاسیدا ناچێت.

بارزانی بانگی کوڕەکەی خۆی، ئیدریس و خالید ناوێکی کرد کە لە نزیک خێمەکەوە بوون، هاتنە ژوورەوە. بارزانی ڕوی کردە خالید و پێی وت: من مەبەستم خالیددکەی تربوو، لەچاوتروکانێکدا خالیدەکەی تر هاتە ژوورەوە، پاشان بۆم دەرکەوت کە خاوەن بڕوانامەی بەرزبوو و زمانی ئینگلیزیشی بەباشی دەزانی. کاتێک هەردووکیان لەسەر زەویەکە دانیشتن، بارزانی داوای لە ئیدریس کرد کە نامەیەک بۆ سکرتێری ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن بنووسێ و پێی بڵێ کە بەهەمسوو شێوەیەک ئاسانکاریی بۆ بکەن. مۆڵەتی ئاخافتنم لێ وەرگرتەوە و پرسیم کە ئاخۆ دەکرێت لەلایەن کۆمیتەی ڕاپەڕاندنەوە یارمەتیم بدرێت و ڕاپۆرتێکم دەربارەی ئەشکەنجە و وێرانکاریەکانی کە لەکوردستانی عێراق ڕوویانداوە، بۆ بنووسن، ئەوەی کە لەدوای ساڵی ١٩٦١ە وە ڕوویانداوە. بارزانی ڕووی کردە ئیدریس و ئەمری پێکرد کە (کۆمیتەی ڕاپەڕاندن) ئەو بەڵگە و ماتریالانە بخەنە ڕوو کە ناهەقی و تاوانەکان بەرانبەر کوردی عێراق نیشان دەدەن لەدوای ساڵی ١٩٦١ەوە، لەسەردەمی قاسم و بەعس و سەردەمی عەبدولسەلام عارف و تەنانەت دوای مردنەکەشی لە بەهاری ١٩٦٦.

بارزانی وشە بەوشە نامەکەی بەئیدریس بارزانی دیکتە (Dictate) نەدەکرد. ئیدریسی رۆشنبیر، کەوەک دەڵێن جێگای رەزامەندی باوکیەتی و هاوکاری نزیکیشیەتی، پێش ئەوەی وشەکان لە دەمی باوکیەوە دەرچن لە مەبەستەکەی دەگەیشت، کەمێک پێش ئەوی ژەنەراڵ بارزانی کۆتایی بەقسەکانی بهێنێ، نامەکەی ئامادەکرد.

ئیدریس نامەکەی دایە دەست باوکی و، ئەویش ئیمزای کردو دایە دەست من. من داوام لە ژەنەراڵ بارزانی کرد کە چەند وێنەیەکی تری بگرم، دوای ئەوە ئەو پێنووسەم پێشکەش کرد کە لەلایەن خاتوو (میرتا هانسۆن) سەرۆکی کۆمیتەکەمان بۆی ناردبوو. ئەویش سوپاسی کردم بۆ دیاریەکە و، جارێکی تر پێڵاوەکانی لەپێ کردەوە و خێمەکەی بەجێ هێشت.

منیش جانتا دەستیەکەم پێچایەوە و کامێراکەم کردە شانم و لەگەڵ خالید و کوڕێکی گەنج بەناوی سوڵتان کە لە پاسەوانانی بارزانی بوو، بەرەو حاجی ئۆمەران کەوتینە ڕێ.

## بینینی کچێکی کوردی- ڕووسی

کاتێک گەیشتینە چاخانەیەکی حاجی ئۆمەران، کاتژمێر خۆی لە پێنج و نیوی پاش نیوەڕۆ دەدا. لەوکاتەی کە خەریکی خواردنەوەی پیاڵەیەک چا بووم و چاوەڕێی ئەوماشێنەم دەکرد کە بڕیاربوو بمانبات بۆ گوندی ناوپردان کە بارەگای کۆمیتەی ڕاگەیاندنی لێبوو. چاوم بەکچێکی چکۆڵەی ٢ تا ٣ ساڵانە کەوت، منیش پرسیارم کرد کە ئەمە کچی کێیە؟ وتیان ئەوە نیوە ڕووسی و نیوە کوردە، کچی پێشمەرگەیەکی بارزانی بوو کە ١١ ساڵ لە ئاوارەیی لە ڕووسیا ژیابوو. منیش داوام کرد کە وێنەیەکی ئەو و باوکی پێکەوە بگرم کە لەو نزیکانە بوو. باوکی ناوی عەلی بارزانی بوو، وتی: پاش چەند دەقەیەکی تر وەرە تا کچەکەی جلەکانی بگۆڕێت و قژی شانە بکات و خۆی جوان بکات. ئێمە نیو سەعاتێک چاوەڕێمان کرد، لە دواجاردا ناچاربووین بچین بەدوای عەلی بارزانی و کچەکەیدا بگەڕێین. پێیان وتین بچن بۆ ئەو خێمەیەی کە عەلی بارزانی و ژنە ڕووسیەکەی و منداڵەکانیان لێی دەژیان. کاتێک لە خێمە نزیک بووینەوە گوێمان لە زریکەی منداڵەکە بوو و هەوڵی دەدا خۆی لە ژێردەستە بەهێزەکانی دایکی دەربهێنێ کە بەتوندی خەریکی داهێنانی قژی کچەکە بوو.

ئەوە شەشەمین ساڵ بوو کە ئەو خێزانە بەزستانان لەم ئەشکەوت بۆ ئەو ئەشکەوت و هاوینانیش لەخێمەدا ژیانیان دەبردە سەر. ئەو کچە بچوکترین منداڵی ئەوماڵە بوو کە لە گەرمەی شەڕێکی کاولکاریدا لە دایک ببوو. عەلی بارزانی بەشانازیەوە لەبەردەمدا بەخۆی یەدەگەکان و کلاشینکۆفە ڕووسیەکەی شانی و دەمانچە و کچە ئەشمیلانەکەی باوەشیەوە، وەستابوو. تەنها یارمەتیەکی ڕووسی کە وەریان گرتبوو دەمانچەکەی بوو. لەڕاستیدا دەمانچەکەش لەلایەن ڕژێمی سۆڤیەتییەوە بۆ سوپای عێراقی نێردرابوو بۆ ئەوەی کۆمەڵگای کوردی لەڕەگ و ڕیشەوە بەخێزانی عەلی بارزانیشەوە، دەربهێنێت.

بە پێچەوانەی ئەو هەموو پڕوپاگەندانەی کە کرابوون، کوردەکان هیچ کۆمەکێکیان لە ڕووسەکانەوە بۆ نەهاتبوو، جگە لەو چەکە ڕووسیانەی کە کوردەکان لە سوپای عێراقیان گرتبوون، لەکاتی هەوڵدانەکانیان بۆ داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان کە ماڵباتی عەلی بارزانیشی لێ دەژیا و لەلایەن سوپای شۆڕشگێڕی کوردەوە پارێزگاری لێدەکرا.

لەماوەی ئەو ١١ ساڵەی ئاوارەیی کورد لە ڕووسیا چەندین ژنی ڕووسی شوویان بەپێشمەرگەکانی بارزانی کردبوو. ئەم ژنانە لە دوای کودەتا سەربازییەکەی قاسم لە ساڵی ١٩٥٨دا، هاتن بۆ عێراق، پاشان ناچارکران پەنا بەرنە بەر شاخەکانی کوردستان، ئەوەش دوای ئەوەی کە قاسم دەستی کرد بەڕاونانی کورد. ئەوان هێشتا پاسپۆرتە ڕووسیەکانیان ماوە و بەڕووسیش لەگەڵ منداڵەکانیان قسە دەکەن. مرۆڤ ئەوەی بەخەیاڵدا دێت کە ئاخۆ بەرژەوەندی ڕووسەکان لە چارەنووسی ئەو هاووڵاتیە ڕووسانە گرنگترە و لە پڕوپاگەندەیەکی کۆمۆنیستانە زیاتر پەل دەهاوێ. ئەو ژنە ڕووسیانە کە من چەند کەسێکیانم لێ بینین، خۆیان لە ژنەکانی تر هەڵداوێرن بەهۆی جل لەبەرکردنی شێوە ئەوروپی و جانتا دڕاوەکانیان کە بۆ هەرشوێنێک بچن لەشانیاندایە هەروەک ژنانی سوێدی.

## کۆمیتەی سەرکردایەتیی شۆڕش

دوای ئەوەی کە لەوێنەگرتن تەواو بووین، گەڕاینەوە بۆ چاخانەکە، جێبێک کە خەلیل بارزانی شۆفێری ژەنەراڵ بارزانی لێی دەخوری، چاوەڕێی ئێمەی دەکرد. بەخۆم و نامەکەی ژەنەراڵ بارزانی کە لە باخەڵمدا هەڵمگرتبوو، لەگەڵ خەلیل کە زمانی ئینگلیزی دەزانی و پاسەوانە کاتییەکەم سوڵتان بارزانی، پێمان پیانا بەرەو گوندی ناوپردان (گوندی نێوان دووپردەکە کە بارەگای سەرکردایەتی شۆڕشی لێ بوو). بەناو گوندی ڕایەتدا تێ پەڕین، خەڵکەکەی لەبەر شەوقی لۆکساندا خەریکی نان و چاخواردنی ئێوارە بوون، لەو چوار چێشتخانەیەی ناو کەپرەکاندا. کاتژمێری هەشتی ئێوارەبوو کە گەیشتینە بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش. بارەگاکە لە چەند کەپرێک پێک هاتبوو. یەکێک لەوانەی کە لە کەپرە گەورەکەدا بینیم دوکتۆر مەحموود عوسمان بوو کە بۆخۆی دوکتۆر بوو، دوکتۆر عیزەدین ڕەسوڵ کە پێنج ساڵ لە ڕووسیا مابووەوە، محەمەد مەحموود (سامی) ئەویش پێنج ساڵ لە بەریتانیا مابووەوە، بەتایبەتی بۆ خوێندن لە زانکۆی لەندەن. عەلی سنجاری کە ڕێکخەرێکی چاک بوو لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا، شەوکەت ئاکرەیی نوێنەری ژەنەراڵ بارزانی لەلای سەرۆک کۆمار جەمال عەبدولناسر و کۆمکاری عەرەب. کە تازەگی لە میسر لەژێر پاڵەپەستۆی دەوڵەتی عێراقدا، دەریان کردبوو. هەروەها حەبیب محەمەد کەریمی لێ بوو کە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی شۆڕش (سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان- ئاراس) بوو. نامەکەی بارزانیم دایە دەستی، پاش ئەوەی کە خۆی خوێندیەوە دایە دەستی ئەوانی تریش کە لەوێ بوون. دوای ئەوەی دەمەتەقێیەکی دۆستانەمان کرد و سەرو چامان خواردەوە، چووین بۆ ساڵۆنی نانخواردنی کۆمیتەی ناوەندی کە لە کەپرێکی تردا بوو، ناوقەدی چوار داری گەورە بووبوونە کۆڵەکەی و پەلوپۆی دارەکانیش بووبوونە سەربانی کەپرەکە.

لەکاتی نان خواردندا دوکتۆر مەحموود وتی: بەخت یارتە، ئەوەی کە دەیخۆیت پاشماوەی خواردنی شاییەکە کە دوێنێ بۆ هاوڕێیەکمان دروستمان کردبوو. خواردنەکەش پێکهاتبوو لە کولێرە بەقیمە. دوکتۆر مەحموود دەربارەی زاوای هاوڕێیان وتی: ئەو ئەم ئێوارەیە لەگەڵماندا نییە. پێویست ناکات ئەو تا لەم کاتەدا بیر لە سنووردانان بۆ منداڵبوون بکاتەوە، لەکاتێکدا کە شەڕ باڵی بەسەرماندا کێشاوە و میللەتەکەشمان هەڕەشەی لەناوبردنی لێدەکرێت. کەم تاقەتی دوکتۆر مەحموود بەباشی تەعبیری لە سوپای پێشمەرگە دەکرد لە کاتی شەڕدا. ئەو پێشمەرگانەی کە خێزان پێکەوە دەنێن کاتی ئیسراحەتیان تەرخان دەکەن بۆ خێزانەکانیان. ئەندامانی خێزان هەمیشە سەریان بەسەری یەکترەوە ناوە، تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە پێشمەرگە خەریکی حەرەسیاتگرتن یانیش ڕاستەوخۆ لە شەڕدا بەشداری دەکەن. زۆر لە جەنگاوەرەکان لەگەڵ خێزانەکانیان، ناوچە دەشتاییەکانیان بەجێ هێشتووە و هاتوون بۆ ناو چیاکان. سەرکردایەتی سوپای شۆڕش ناچارە کە ئەو خێزانانە بژێنێ. هەر ئەو کاتەی کە من خەریکی خواردنی بەرماوەی زەماوەندێکی ئاسایی بووم ، بیست و پێنج هەزار کەس لەلایەن سوپای پێشمەرگەوە خواردنیان دەدرایێ. وەکو من بیستم سوپای پێشمەرگە ماوەیەکی زۆر جگە لە نان و چا نەیتوانیووە هیچ خواردنێکی تریان بداتێ.

لە دوای نان خواردنەکە لە دوکتۆر مەحموودم پرسی کە ئاخۆ پێویستە لەداهاتووشدا من هەر بەنهێنی خەریکی کارەکانی خۆم بم. لەوەڵامدا وتی: «نەخێر. خۆ کۆمیتەی سویدی - کوردی داوای هیچ داخوازیەکی نهێنییان نەکردووە. ئێوە دەتانەوێت لەسەر ژیان و گوزەرانی خەڵکی سڤیلی کورد لێکۆڵینەوە بکەن و لەلایەن ژەنەراڵ بارزانیشەوە ڕێگاتان پێ دراوە و داوای لە ئێمەش کردووە کە هەموو شتێکت لەبارەی ڕێکخراوەکەمانەوە پێ بڵێین، جگە لە شتی سەربازیی و داخوازیە سیاسییەکان و کاروباری ڕێکخراوەیی کە ئێمە هەمیشە ویستوومانە لەگەڵ ڕژێمی بەغدا دا موناقەشەی بکەین».

## ژووره تایبەتییەکەی کۆمیتەی بەڕێوەبەر بۆ میوان

دوای ئەوەی چەند پیاڵە چایەکمان خواردەوە، بردمیان بۆ ژوورەکەم، کە ئێمە بەگاڵتەوە پێمان دەوت «خانووە خاسەکە alowen Bun». من دە ڕۆژ لەگەڵ برایەکی سکرتێردا کە ناوی حەسەن حەیدەر بوو، مامەوە. ڕووبەری ژوورەکە سێ بەچوار مەترێک دەبوو کە بەپوشکە سەری داپۆشرابوو و بەچوار دارەوە بەسترابووەوە. فەرشێکی نیوە دڕاویان لێ ڕاخستبوو. بەچوار دەوری فەرشە جوانەکەماندا سێ قەرەوێڵەی ئاسنیان لێ دانابوو، دۆشەکی تەنک و دوو بەتانی، کە نیشانەی خاچی سووریشیان لەسەر بوو. پێشمەرگەیەکی لاو کە ناوی محەمەد ڕەمەزان بوو، لە ژوورەکەی تەنیشتمانەوە دەژیا، ژوورەکەی ئێمەی خاوێن دەکردەوە. سەرچەفێکی تەنکی دامێ کە هی خاچی سووری هەنگاری بوو، منیش دام بەسەر دۆشەکەکەمدا.

هەروەها لۆکسێکمان هەبوو کە هەریەک لە ئێمە لەلای خۆیەوە دەیتوانی شتی لەبەردا بخوێنێتەوە. حەسەن حەیدەر بەعەرەبی و کوردی دەینووسی و دەیخوێندەوە، من هیچ سوودێکم لە کتێبەکانی ئەو وەرنەدەگرت. لە جیاتی ئەوە چەند ژمارەیەکی تایمس و نیوز ویکم دۆزییەوە کە لە ستۆکهۆڵم خوێندبوومەوە. لە چوار دەوری لۆکسەکە دنیایەک لە حەشەراتی دڵرفێنی جۆراوجۆر کۆبووبوونەوە، بەجۆرێک کە مرۆڤ هیچ کات هەستی بەتەنیایی نەدەکرد. خۆیان بەلۆکسەکەدا دەکێشاو هەندێکیان دەسووتان و دەکەوتنە خوارەوە بۆ سەر جێگاکانی ئێمە. هەموو بەیانییەک کە سەرچەفەکانمان هەڵدەتەکاند سەدان حەشەرات هەڵدەوەرین.

یەکەم شەو هێشتا نەچووبوومە سەرجێگاکەم، عەلی سنجاری کە ئەندامی کۆمیتەی ڕاپەڕاندن بوو، هات بۆ لام و پێی وتم کە ناخۆ دەتوانێت ببێتە چاوساغم لەو دەوروبەرە. بەهەچ هۆیەکەوە بێت ئەو بووە هاوڕێم و تێگەیشتم کە ئەو بۆ ئەوە هاتووە تا بەرنامەڕێژیی ڕۆژی

داهاتووم بۆ بکات. پێش ئەوەی بەجێیم بهێڵن لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی کە لە ژوورەکەدا لەگەڵم دەخەوتن، بڕیارمان دا بەیانی سەردانی خەتی چاودێری عێراقی- کوردی بکەین.

## سنووری نێوان کورد و عەرەب

لە شەش ساڵ لەمەوبەرەوە کورد داخوازیی خۆیان بۆ ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی سنووری کۆماری عێراقی تازە بنیاتنراودا، دووبارە دەکردەوە. زۆربەشیان مەبەستیان لە ئۆتۆنۆمی، سەربەخۆیی کلتووری و رێکخراوەیی بوو. ئەوان هیچ داوایەکی نوێیان نەخستبووە سەر ئەو داخوازیانەی کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان کە لە لایەن بەریتانیا و رژێمی بەغدا و نەتەوە یەکگرتووەکانەوە گەرانتی کرابوو. ئەوە جاری یەکەمە کە کورد دەکەونە بەر توندوتیژی عەرەب لە مێژووی نوێدا. رژێمی عێراق داوای ناوچەیەک دەکات کە لەکاتی سەرهەڵدانی چەکداری و نارەزایەتی کورد بەعێراقەوە لکێنرا. کورد لە کۆنەوە نیشتەجێی ئەو ناوچانەن. ئەم سنوورە تازەیەی نێوان کورد و عێراق هەر هەبووە، زۆر پێش لەوەیش کە کێشەی کورد و بەغدا دەست پێ بکات واتە پێش جەنگی یەکەمی جیهان. رژێمی عێراق نایەوێت وشەی کوردستان بەکاربهێنێت، کە لە راستیدا لە سێ بەش بەشێکی ئەو وڵاتە پێکدەهێنێ. پێویستە ئەوەش بوترێت کە ئەم ناوچەیە (باشووری کوردستان) بەهۆی زۆری رووباری گەورە و گچکەوە، دارایی سەرچاوەیەکی ژیانی بەپیت و بەرەکەتە، کە بەرەو پێدەشتەکانی خواروو دەکشێن. گەلێک جار سەرچاوە گرنگەکانی ئەو ناوچە دەشتاییانە فەرامۆش دەکرێت. تەنها باسی نەوت دەکرێت کە ئەویش لە ناوچە کوردییەکانەوە هەڵدەقوڵێت و بەشێکی گەورەی بۆ کاولکردنی کوردستان بەکاردەهێنرێت.

لە سەردانە کاتییەکەماندا بۆ سنووری کورد بەچاوی خۆمان جیاوازیەکانمان بینی، لە شێوەی دیواری سروشتیدا: شاخەکان روویان لە دەشتەکان کردبوو، ئەم گەلە لە شێوەی عادات و کلتووریدا بەتەواوەتی لە عەرەب جیاوازن.

یەکێک لەو رووبارانەی لەناوچە کوردییەکانەوە بەرەو پێدەشتەکان

دەکشێت تا ژیان بەخشی بەدانیشتووانی دەشتاییەکان.

بەریتانیی و سەرکردەکانی دەوڵەتی نوێی عێراق وایان دەزانی کە بەهێرشە ئاسمانی و تۆپخانەکانیان دەتوانن ئەو دیوارە سروشتیانە برووخێنن. بەڵام هاوکێشەکانیان، لنگاوقوچ دەرچوو. لە کاتێکدا کە من ئەم چەند دێرە دەنووسم، دەنگۆی ئەوە هەیە کە عێراق خەریکی سەوداکردنی کرینی فڕۆکەی گەورەیە کە تواناى هەڵگرتنی بۆمبی چەند تەنی هەبێت. بەم شێوەیە لەهەوڵ و کۆششی ئەوە دان، کە بتوانن زیاتر ئەو ناوچەیە کاول و وێران بکەن و خەڵکە سڤیلەکەی سەرگەردان بکەن. ژن و منداڵ هەوڵ دەدەن هەرچۆنێک بێت، خۆیان لە ناو شوێنە سروشتیەکاندا بشارنەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە دەوڵەتی عێراق بۆمبی زۆرتر و گەورەتر بەسەر ناوچەکەیاندا دەبارێنێت.

## سنووری کورە و هێزەکانی عێراق لە ڕەواندز

ڕۆژی شـەممە ڕێکەوتی ۲۰ی ئاب، دوای نانی نیـوەڕۆ، عـەلی سنجـاری بەخۆی و پەیامبەرێکی سوپاییەوە کە جانتای بەرپرسەکەی هەڵگرتبوو، هات بۆلامان. دوای ئەوەی چەند پیاڵە چایەکمان خواردەوە چووین بۆلای ئەو لۆریەی کە پێشمەرگە لە سوپای عێراقییان گرتبوو. پشتی سەیارەکە پڕبوو لە پێشـمەرگە کە هەریەکەو بەلایەکدا بەرەو جێگای خزمەتکردنیان دەچوون لەسـەر ڕێگای ڕەواندز - حاجی ئۆمەران. لەناوەڕاسـتی کورسی دوایی سەیارەکە نەخۆشێک دانیشتبوو کە بەئازاری نەخۆشیی (جگەر)ەوە دەیناڵاند. بۆ بەدبەختـی ئەو سـەیارەکـە تایەیەکی پەنچـەر بوو. لەبەر سێبەری دارێکدا ڕایانکێشا. من و عەلی سنجاری بەپیاسەکردن بەرەوە ئەو چاخانەیە چووین کـە لەو نزیکانەبوو. لەوێ لەگـەڵ پێشـمەرگـەیەکی تورکمان ئاشنابووم کە فڕۆکەیەکی عێراقی خستبووە خوارەوە. دەمانچەی فـڕۆکـەوانەکـەی لەقـەد بەسـتبوو و نیـشـانەی هێـزی هەوایی عـێـراقی هەڵگرتبوو. پاش نیو سەعات بانگیان کردین و درێژەمان بەسەفەرەکەمان دا بەرەوە ڕەواندز.

بەرپرسی میحوەری شەڕەکە، کابرایەکی بەناوبانگی عەسکەریی بوو کە ناوی عەبدوڵلا ئەحمەد ئاغای ڕەواندزی بوو. لەدوای هێرشی عێـراق بۆ سـەر ناوچەکـە، بەشـێکی گـەورەی ئەو ناوچەیە بەگـوندەکـانیـشـیـەوە بەتەواوەتی سووتێنرابوو. کاتێک چاوت بەناوچەکە دەکەوت کە سەرتاپای کرابووە قاقنەس و بەپاشماوەی گیـا و دار و دەوەن داپۆشرابوو، ترسـێکی گـەورە دایدەگـرتیت. وەکـو ئەوە وابوو کـە بەتەورێکەوە بەشـێـوەیەکی وەحشیانە بکەویتە ناو باخێکەوە، شەلم کوێرم ناپارێزم.

عەبدوڵلا ئەحمەد ئاغا بۆ خۆی بەشداری لە دوا شەڕی بەرگری لە شاخی هەندرێن، کـردبوو، کـە دەکـەوتە لای خـوارووی ئەو جـێـگایەی ئـێـمـەی لێبووین. ڕژێمی عێراق ساڵی ۱۹٦٦ هێزەکانی خۆی لە چواردەوری شاری

ڕەواندز کۆکردبووەوە، کە چەند کلیۆمەترێک دوور بوو لەو جێگایەی کە ئێمەی لێ بووین. بەجوانی تۆپە گەورەکان، سەربازگە گەورەکانمان دەبینی کە کەوتبوونە بەشی خوارەوەی شار. شارەکە بۆ خۆی کەوتۆتە سەر سنگی شاخێک و ڕیزە ماڵێکی گڵێنەی کوردانەی لێ دروست کراوە. وا بەرنامەڕێژیی کرابوو کە شەوی ١٥ لەسەر ١٦ی نیسان هێرش بکرێت، ئەوە بوو ڕۆژی ١٤ی مانگ سەرۆک کۆمار عەبدولسەلام عارف لە ڕووداوێکی گوماناویی هەلیکۆپتەردا لەنزیک شاری بەسرە گیانی لەدەست دا.

عەبدولسەلام عارف بەیەکێک لە دوژمنە سەرسەختەکانی کورد دەژمێردرا. مردنی سەرۆک کۆمار هیوایەکی نوێی خستە دڵی خەڵکەوە کە بەڵکو کێشەی کورد بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەربکرێت. هەر دوای مردنەکەی عارف، کورد لە ڕێگای ڕادیۆی دەنگی کوردستانەوە بانگەوازێکیان ئاراستەی ڕژێمی عێراق کرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەڕێگایەکی ئاشتیانە. ڕژێمی عێراق بەهێرشێکی گەورە وەڵامی کوردەکانی دایەوە کە لە سێی گوڵاندا دەستی پێکرد.

هێزێکی سەربازیی کە پێکهاتبوو لە (٣٠) هەزار سەرباز و پێنج هەزار جاشی کورد هێرشیان هێنابووە سەر چیای هەندرێن، کورد لە ژێر فەرماندەیی عەبدوڵڵا ئەحمەد ئاغای ڕەواندزیدا بەرگریان کرد بوو. پاش شەڕێکی بەردەوام کە ١٠ ڕۆژی خایاند، بەیارمەتی تۆپخانە و فڕۆکەی جەنگیی عێراق، لە ڕۆژی ١٢ گوڵاندا توانییان نیوەی شاخی هەندرێن داگیربکەن. ئەوان وایان دەزانی کە هەموو شاخەکەیان بەتەواوەتی داگیرکردووە، هەربۆیە هێرشیان کردە سەر چیای زۆزک. ئامانجی هێرشەکانیان ئەوە بوو کە لەدوو لاوە بتوانن کۆنترۆلی ئەم بەر و ئەوبەری ئەو دوو بەرزاییە بکەن، تا لەو ڕێگایەوە دەست بگرن بەسەر ڕێگای گرنگی حاجی ئۆمەران-ڕەواندزدا. پێ دەچوو کە ڕژێمی عێراق زۆر گەشبین بووبێت بەگرتنی ئەو دوو شوێنە ستراتیجیە. ڕێنومایی هێزی هەواییان

کردبوو کە لە ڕووخاندن و خراپکردنی ڕێگاکاندا خۆ ببوێرن. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ڕێگاکان وەکو خۆیان بمێننەوە. بەڵام هەرچییەک بۆنی ژیانی لێ هاتبوو خرابووە بەر دژوارترین هێرشیی تۆپخانە و فڕۆکە. لە شوێنێکی تری ئەم باسەدا لە کاولکاریەکانی ئەم هێرشە دەدوێم. ئەوە یەکەمین جاربوو لەماوەی شەش ساڵی شەڕدا کە گوندەکان بەشەویش بۆردومان دەکران. گوندییەکان کە بەشەوانە دەگەڕانەوە بۆ ناو ماڵەکانیان، ناچاربوون لەو شوێنانەدا بمێننەوە کە خۆیان تێدا دەشاردەوە لە نزیک گوندەکانیانەوە.

ڕۆژی ١٢ی گوڵان سوپای کورد هێرشێکی بەرپەرچدانەوەیان کردە سەر سوپای عێراقی و لەماوەی یەک ڕۆژدا توانییان چیای هەندرێن لەدەست سوپای عێراق ڕزگاربکەن. هێرشی سوپای کورد هێندە بەخێرایی و کاریگەر بوو، کە سوپای عێراقی نەیتوانی بەئاسانی خۆیان و جبەخانەی لەبن نەهاتوویان ڕزگاربکەن. کورد توانیان دەست بگرن بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە کەرەستەی سەربازیی کە زۆر بەکەڵک بوو بۆیان.

عەبدوڵلا ئەحمەد ئاغا کە خۆی ئەخشەی هێرشەکەی دارشتبوو، ئەو شوێنانەی نیشان دەداین کە کورد هێرشیان لێوە کردبوو. باسی ئەوەی دەکرد کە ژمارەیەکی زۆر لە ژنان پشتیوانیان لە پێشمەرگە کردبوو لەکاتی دەستپێکردنی هێرشەکەدا، خۆشیان ئامادەکردبوو تف بکەنە ناوچاوی ئەو سەربازانەی کورد کە ئەگەر لە بەردەم سوپای بەهێز و پڕ چەک و نابەرانبەری عێراقدا هەڵبێن. سوپای عێراقی کە دە قاتی پێشمەرگەکانی کورد دەبوون، هەلێکی باشیان بۆ ڕەخسابوو تا خۆیان لە خۆرئاوای چیای هەندرێن قایم بکەن.

ژنەکان پێویستیان بەوە نەبوو کە بێ ڕێزیی بەپیاوەکانیان بکەن، چونکە ئەوانەی گەڕانەوە سەرکەوتوو بوون، ئەوانەشی لە شاخ مانەوە، وەکو قارەمانێک گیانی خۆیان بەخشی. هەر لەسەرەتاوە هێرشەکە سەرکەوتوو

بوو. هەزاران سەربازی عێراقی وێڵ و سەرگەردان بووبوون و ڕایان کردبوو، کاتێک کورد هێرشیان کرد. عێراقییەکان بەشەرمەوە پاشەکشەیان کرد و لەدوای خۆیان هەزار کوژراو و هەرچی کەلوپەلیان بوو بەجێیان هێشت.

ژەنەراڵ بارزانی سەربڵندانە، بۆ ماوەی ڕۆژێک تەقەی ڕاگرت و داوای لە عێراق کرد کە با بێن تەرمی کوژراوەکانیان بەرنەوە، بەڵام سەرۆکی سوپا ئامادە نەبوو دان بەکوژراوەکاندا بنێت. ئەوان دەیانوت ئەو تەرمانەی کە لە شاخی هەندرێن کەوتوون، تەرمی چەتە کوردەکانن.

سەرۆکی سوپای عێراقی لە ڕەواندز شایەتی تێکشکانە گەورەکەی خۆیان بوو، کەچی لە ڕادیۆی ڕژێمەوە گوێ بیستی پیاهەڵدانی ڕژێم بووین بۆ ئەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێنابوو. ئەوە بوو فەرماندەکە بەتەلەفۆن ئاگاداری ڕژێمی کرد کە با تۆزێک دەست بگرن بەپیاهەڵدانی سەرکەوتنەکەیەوە.

ئیدریسی کوڕی ژەنەراڵ بارزانی کە بۆ خۆی بەشداری لە شەڕەکەدا کردبوو، چەندین جار هەواڵی کوشتنی خۆی لە ڕادیۆی عێراقەوە بیستبوو. ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسی (ڕێنێ ماوریس) لەکاتی شەڕەکەدا لەوێ بووبوو. ئەو بۆ خۆی لەگەڵ ئیدریس بارزانی خەریکی چاخواردنەوە بوو بوون کاتێک لە ڕادیۆی عێراقەوە هەواڵی کوشتنی بڵاوکرابووەوە. کاتێک بەدووربینەکەی (پشدەری) سەیری ڕەواندزم دەکرد، شەش تۆپم ژمارد، کە لە بەردەم سەربازگەکەدا دانرابوون. لە پشدەریم پرسی کە ئاخۆ هۆی چی بووە کە پێشمەرگە لە دامێنی چیاکەدا گیرسابوونەوە، لە کاتێکدا دەیانتوانی درێژە بەسەرکەوتنەکانیان بدەن.

لە وەڵامدا وتی: ئێمە هیچ بەهانەیەکمان نییە کە واز لە پرنسیپی بەرگری لە خۆمان بهێنین. شەڕی ئەم دواییە باشترین نموونەیە لە تاکتیک و بەرگری و هێزمان. هەتا ئێمە لە ناو چیا سەرکەشەکانماندا بەرگری لە خۆمان بکەین، ڕژێمی عێراقی ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێ بەسەر

سوپای مەشقپێکراوی ئێمەدا. هەروەها ئێمە بووینەتە خاوەنی تۆپخانەی قورس و ئێستا باشتر لە جاران دەتوانین خۆمان لە هێرشی ئاسمانی بپارێزین.

ئێمە بووینەتە خاوەنی چەکی قورس کە لەشەڕدا لە دوژمنمان گرتووە، شارەزایی سەربازێمان لە سوپای پێشمەرگەدا وایکردووە، کە تەرازووی هێزی شەڕ، بەقازانجی خۆمان ڕابگرین. هیچ مۆڵگەیەکی عێراقی نییە کە تۆپەکانی ئێمەی نەگاتێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕژێمی عێراق باش دەزانێت کە ئێمە هەموو هێزی خۆمان دەخەینەکار، کاتێک بێتە سەر پێوانەی هێز.

عەبدوڵلا ئەحمەد ئاغا، لە قسەکانیدا، لە بەکارهێنانی وشەی سەرکەوتن یاخود تێکشکان خۆی دەپاراست. وەکو زۆری تر ئەویش پێی وابوو کە چۆن عەرەبی عێراقی بتوانن کەمترین سەرکەوتن بەسەر کورددا بهێنن، بەهەمان شێوە کوردیش دەتوانن سەرکەوتن بەسەر عەرەبدا بهێنن. گەورەترین گرفت ئەوەیە کە چۆن بتوانرێت هەلومەرج و یەکسانی لەهێزدا بخولقێنرێت تاکو ئاشتی لە بەینی کورد و عەرەبدا دەستەبەر بکرێت.

لە سێیەکی خاکی بەپیت و سەروەتمەندی عێراق، کورد نیشتەجێن لێی. هەزاران ساڵە کورد لەسەر ئەو خاکە دەژین، بەچاوی خۆیان داگیرکەرانی وەکو ئەلەکسەندەر و مەغۆل و تاتار و عەرەبیان بینیووە تا دەگاتە ئەم سەردەمەی ئێستایان. بنەماڵەی کورد هەن کە دەتوانن بنەچەی خۆیان تا سەردەمی پێش مەسیح بگەڕێننەوە. بەدرێژایی مێژوو دابڕانێک لە نێوان سنووری کورد و عەرەبدا هەبووە و هەیە. ئەم سنوورە درێژ دەبێتەوە تا دوا شاخ و دەشتەکان لەیەکیان جیادەکاتەوە، پاشان بەرەو سەحراکانی لای سوریا لە لای ڕۆژئاواوە و تا سەحرا بێ سنوورەکانی نزیک کەنداوی عەرەب درێژدەبنەوە. چوار پێنج ساڵێک دەبێت، لە سێ بەش دوو بەشی کوردستانی عێراق (باشووری کوردستان)، لە ژێر کۆنترۆڵی سوپای

شۆڕشگێڕی کورد دایە. ئەو بەشەی تری کوردستان (مەبەست لەو بەشەیە کە لەژێر دەستی عێراقدایە)، کە ناوچەیەکی باریک پێکدەهێنێ و دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای ئەو بەشەی کە لەژێر دەستی کورد خۆیان دایە، ئەم ناوچەیە وەکو پردێک چیاکان و دەشتاییەکان بەیەکەوە گرێ دەدات. هیچ کاتێک ئەم ناوچانە هی عەرەب نەبووە، سنوورە سروشتییەکان هەزاران ساڵە هەبوونیان هەیە.

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە، کوردستان (باشووری کوردستان) بەعێراقەوە لکێنرا، یەکێک لە هۆیەکان ئەوە بوو کە عێراق بەبێ سەرچاوە زۆر و زەبەندە سروشتییەکانی کوردستان نەیدەتوانی خۆی بەڕێوە بەرێت. ئەم بەزۆر پێکەوە لکاندنە بۆ کورد جێگای ناخۆشحاڵی بوو، چونکە ئەوان ناتوانن بەشێکی سەرچاوە سروشتییەکانیان بۆ خۆیان بەرن. کەچی ئەم بەزۆر گرێدانە یارمەتییەکی باشی بوژاندنەوەی ئابووری عێراقی داوە لەماوەی ئەم چل ساڵەدا(١٩٢٠ تا ١٩٦١)، واتە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕی کورد. لەو کاتەوە بەشی هەرە زۆری قازانجی سەرچاوە سروشتییەکانی کوردستان لەلایەن عێراقەوە بۆ کاولکردنی کوردستان و لەبەریەک ترازاندنی کۆمەڵگای کوردستان تەرخان کراوە. ئینگلیزەکان لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کوردستانیان لەگەڵ میسۆپۆتامیا گرێداو وڵاتی نوێی عێراقیان لێ پێکهێنا. لەڕاستیدا عێراق ناوی ئەو بەشەی خوارووی وڵاتەکەیە. ئینگلیزەکان توانیان کورد لە ناو سنووری عێراقدا بهێڵنەوە، بەپشتیوانی هێرشە هەواییەکانیان بۆ سەر گوندە کوردییەکان، لە بەرانبەر هەر ڕاپەڕینێکی کوردەکاندا. ئەم هێرشە هەواییانەی بەریتانیا بۆ سەر ژن و منداڵی کورد کە تارادەیەکی زۆر بۆ خەڵکانی دەرەوەی ئەو ناوچەیە نا ناشنان، دەبوو پەڵەیەکی شەرم بوایە، بەتەوێڵی هێزی هەوایی بەریتانیاوە.

هەموو ساڵی ١٩٦١ دەوڵەتی عێراق لە خۆئامادەکردندا بوو بۆ شەڕێکی نوێ، بۆ سەرکوتکردن و داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان. دەیانویست

کوردستان بەتەواوەتی هەڵلوشن. لە خۆڕا نەبوو کە عێراق زۆر بەدیقەتەوە لە بەکارهێنانی وشەی کوردستان خۆی دەبوارد، کە لە سێ بەش بەشێکی خاکی ئەو وڵاتە پێکدەهێنێت. دامودەزگای ڕاگەیاندنی دەوڵەت و نوێنەران و قسەکەرە ڕەسمیەکانیان هەمیشە وشەی «باکوری خۆشەویستیان» بەکاردەهێنا بۆ وڵاتێک کە هیچ کاتێک مولکی عەرەب یان کلتووری ئەوان نەبوو. لە ماوەی ئەم شەش ساڵەدا دەسەڵاتدارانی سوپایی بەکردەوە هەموو پێداویستییەکی ئابووری و سەربازییان خستۆتەگەڕ بۆ ئەوەی بتوانن دەست بەسەر کوردستاندا بگرن. سەرەڕای ئەمانەش سنووری نێوان کورد و عەرەب لە هەموو کات زیاتر دیاری کراوترن. من خۆم شایەتی ئەوەم، کاتێک لە دۆڵی نێوان چیای زاگرۆس و هەندرێنەوە، تەماشای شاری گەمارۆدراوی ڕەواندزم دەکرد. چواردەوری شارەکە لەژێردەستی پێشمەرگە دایە و ناو شارەکەش بەڕێگایەکی باریکی بچکۆلە لەلای خوارووییەوە بەبەغداوە گرێدراوە، ئەو ڕێگایەش کورد کۆنترۆڵی دەکەن.

بە درێژایی مێژوو، کوردانی ئازادیخواز کە لە نێو چیا سەرکەشەکانیان دەژین و ئێمە پاڵمان پێوەدابوون، هەرەشەیان لە دراوسێکانیان نەکردووە. بەڵام بەپێچەوانەوە خۆیان چەندین جار کەوتوونەتە بەر هەرەشەی توانەوە و نەمانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کاتێک کورد ڕووبەڕووی میتۆدی دڕندانەی وەکو ئەوەی لە شەری ئێستادا ڕووبەڕوویان کراوەتەوە، نەبوونەتەوە. لە ماوەی ئەم شەڕەی ئێستادا ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمدان کەوتوونەتە بەر شاڵاوی توانەوە. هەندێک لەوانە توانیویانە خۆیان بگەیەننە ناوچە ئازادکراوەکان، بەشێکیشیان ڕاگوێزراون بۆ شوێنانی تر.

ڕژێمی عێراق تایەفە عەرەبە کۆچەرەکان لە شوێنی کوردەکاندا جێگیردەکات. لە ڕاستیدا هەر کورد بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕووبەڕووی ڕاونان و ئەشکەنجە بوونەتەوە. هەر بەو هۆیەوەیە کورد لەوباوەڕەدان کە چەک دانان و تەسلیم بوون بەعێراق مانای لەناوچوونی نەژادی کورد و

کلتوورەکەیانە. بەهەموو بڕوایەکەوە کورد بەرگری لەو سنوورە سروشتییانە دەکەن، هەتا هێرش نەکرێتە سەریان. لە ماوەی ئەم شەش ساڵەدا، ناوچە ئازادکراوەکانی ژێردەسەلاتی کورد لەلایەن خۆیانەوە حوکمڕانی دەکرێت. لە ڕاستیدا دەوڵەتێکی سەربەخۆیە. هەموو ئەو ناوچانەی کە سنووریان بەئێران و تورکیاوەیە لەلایەن کوردەوە کۆنترۆڵ دەکرێت. بەڵام کورد هیچ خۆشییەکیان نە لە عێراق و نە لە ئێران نەبینیوە. ئەو دوو وڵاتە کێشەکە وەکو کێشەیەکی ناوخۆی عێراق دەبینن، لە چوارچێوەی سەربەخۆیی ئەو وڵاتەدا. ئەو دوو وڵاتە سیاسەتێکی توندوتیژ لەدژی کوردستانی عێراق بەکاردەهێنن و سنوورەکانیان بەڕووی کورداندا، دادەخەن. ئەگەر بەچاوێکی مرۆڤ دۆستانەوە بۆ کێشەکە بڕوانین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە عێراق و ئێران سیاسەتێکی دژوار بەرانبەر کورد بەکاردەهێنن. ئەگەر کارەساتێک لەو دوو وڵاتە ڕووبدات، ئەوا کەڵک لە یارمەتییە دەرەکییەکان وەردەگرن، بەڵام لە بەرانبەر تراژیدیای کورددا کەمتەرخەمن. ڕژێم هەلێکی باشی بۆ ڕەخساوە کە بەرگریکردنی کورد کە ئەوان پێی دەڵێن یاخیبوون، لە خوێندا نقوم بکات. لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی شەڕدا، ڕژێمی عێراق بەشێکی گەورەی کوردستانی کاول و وێران کردووە و خەڵکە مەقیلەکەشی دووچاری ئازارێکی بێ وێنە کردووە. زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا، خەڵکی سڤیلی کورد هەمیشە لەناو ماڵوێرانیدا خۆی بینیوەتەوە. بەڕاستی سەیرە چۆن ئەم میللەتە توانیویەتی بمێنێ، لە کاتێکدا هەمیشە خۆی لە خەتی بەرگریدا بینیوەتەوە. ئالێرەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەگەر گەلێک بیەوێت بژی، کەس ناتوانێت تێکی بشکێنێ، جا داگیرکەر چەند خۆی بەگەورە بزانێت.

هەڵوێستی هەردوو دەوڵەتی ئێران و تورکیا بەرانبەر بەکێشەی کورد مانای ئەوە نییە وا لێک بدرێتەوە، خەڵکی ئەو وڵاتانە ئاگایان لەوە نەبێت کە چی لە باشووری کوردستان ڕوودەدات. هەر بۆیەش ئارەزووی ئەوە دەکرێت کە دەسەڵاتدارانی ئەو دوو وڵاتە کارئاسانی بۆ گەیاندنی

هاوکاریە مرۆییە جیهانیەکان بۆ خەڵکی ئازارچەشتووی ناوچە کوردییەکان بکەن. کارێکی مرۆڤانەی لەو جۆرە دەبووە هۆی ئەوەی کە جیهان بەچاوێکی ترەوە لەو وڵاتانە بڕوانێت، لە کاتێکدا کە ڕای گشتی چاودێری تراژیدیای کورد دەکات. چەند وێنەیەکمان لە خانووە ڕووخاوەکەی عەبدولوەهاب محەمەد عەلی ئاغای ڕەواندزی گرت. ناخۆشحاڵی خۆی دەربڕی کە ئەمان دەتوانی لای ئەوان بمێنینەوە بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ. خاترخوازیمان کرد و بەرەو گوندی ڕێزانۆک کەوتینە ڕێ.

## دیدار لەگەڵ عەرەبێک کە زمانی تۆپخانەیە

لە گوندی ڕێزانۆک لەلایەن کاپتن کەمال نوعمانەوە میوانداری کراین، ئەو پیاوێکی عەرەبە و لە ڕیزی سوپایی شۆڕشگێری کورددا خەبات دەکات. زمانی کوردی نەدەزانی، هەربۆیە عەلی سنجاری ئەرکی وەرگێرانی کێشا، تێڕوانینەکانی خۆی بۆ شی دەکردینەوە لەمەڕ ئەو ڕەوشە ئارامەی کە لە ئارادابوو. پێشبینی ڕووداوی خراپی دەکرد، بێدەنگی ڕژێمی بەغدا لەپەیوەندی لەگەڵ کێشەی کورددا. ئەو لەوبڕوایەدا بوو، بەڵکو دڵنیاش بوو لەوەی کە دەسەڵاتدارانی سوپای عێراقی بەبڕیارن لەسەر کڕینی چەکی قورس، بەتایبەتی فڕۆکەی جەنگی گەورە کە توانای هەڵگرتنی بۆمبای پێنج تەنی هەبێت تا لە دژی کورد بەکاری بهێنن. باسی ئەوەشی دەکرد کە هەندێک لە زلهێزەکان چەک بەڕژێمی عێراق دەفرۆشن هەتا ئەوکاتەی پارەی هەبێت، یاخود بتوانێت لە کوێت و سعوودیە قەرز بکات.

هەموو ئەوانەی کە لەم کێشەیەدا بەشدارن، ئەوە باش دەزانن کە ئەو چەکانە بەدژی کورد بەکاردەهێنرێن، چونکە ڕژێمی عێراقی لەلایەن هیچ هێزێکی دەرەکییەوە هەڕەشەی لێ نەکراوە و خۆشی هەڕەشە لە دراوسێکانی ناکات. ئەوە بۆ پێنج ساڵ دەچێت لەهەڵپەی کڕینی چەک و بەفیڕۆدانی سەروەتی وڵات دان. هەر لەم ماوەیەشدا بەبێ خواستی ڕژێمی عێراق، لایەنی بەرانبەر (کورد) بوونەتە خاوەنی چەکی زیاتر، کە پێنج ساڵ لەمەوبەر شەڕ دەستی پێکرد، کورد، ئەیان دەوێرا خەویشی پێوە ببینن.

کاپتن نوعمان لەسەری دەڕوات و دەڵێت: من عەرەبم و دەرەجەدارێکی دەرچووی تۆپخانەم، لەو باوەڕە دام کە سوپای عێراقی لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا لە ڕەوشێکی وادا نییە کە بتوانێت بەسەر کورددا سەربکەوێت. ڕژێمی عێراق بۆ خۆشی لەو ڕاستییانە گەیشتووە، هەربۆیە هەوڵ دەدات تەرازووی هێز لە ڕێگای بەکارهێنانی چەکی قورسەوە تێک بدات. سوپای

عێراقی بۆی دەرکەوتووە کە هەموو دارایی سوپای عێراق بەشی ئەوە ناکات کە بەسەر سوپای کورددا سەربکەوێت لەو ناوچانەی کە سروشت پارێزگاریان لێ دەکات. ئێوە حسابی ئەوە بکەن کە بەو بۆمبایانە ناوچەیەکی زیاتر لە کوردستان وێران دەکرێت و خەڵکە سڤیلەکەشی دووچاری ئازارچەشتنێکی زیاتر دەبنەوە. شەڕی ناوخۆ لە عێراق بووەتە سەرچاوەیەکی پەیداکردنی پارە بۆ ڕژێمی سەربازی بەغدا و لایەنگرەکانیان. بازرگانی چەک کڕین بە"ئێوە ئاشکرا" لە بەینی کورد و سوپای عێراقدا دەکرێت. ڕەنگە ئەمە وەکو شتێکی سەیر چاوی لێ بکرێت. بەڵام ئیمکانی ئەوە هەیە کە لە گەرمەی شەڕدا بتوانرێت چەک لە سوپای عێراقی یاخود جاشە کوردەکان بکڕدرێت. ڕەنگە ئەمە بۆ کەسێکی گەشتکەر نائاسایی بێت. بەڵام بۆ کەسانێک کە لەناوچەکەدا دەژین و هیچ داراییەکی تریان نییە، کارێکی سروشتییە. بەتایبەتی ئەمە لە دەرەجەی یەکەمدا جاشە کوردەکان دەگرێتەوە کە پێویستە شەڕەکە بۆ ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان، بەکار بهێنن. ئەگەر ئەوان چەک هەڵگرتن بۆ ڕژێم ڕەت بکەنەوە ئەوا دووچاری زیندان و ئەشکەنجە دەبنەوە و یانیش دەست دەگیرێت بەسەر ماڵ و موڵکیاندا و بەزۆر ڕادەگوێزرێن.

لە ڕاستیدا کەسوکاری ئەم جاشانە وەکو بارمتەیەک وان لەژێر دەستی ڕژێمی عێراقدا. ئەگەر جاشەکان، چەک هەڵگرتن بۆ ڕژێم ڕەت بکەنەوە، مەترسی ئەوەیان هەیە کە کەسوکاریان لەدەست بدەن. ئەم سەربازانە (جاشانە) مانگانە ١٥٠ کرۆنی سویدی وەردەگرن، لەبەرئەوەی ئەم پارەیە بەشی ئەوە ناکات کە خێزانەکانیانی پێ بژێنن، بۆیە چەک و تەقەمەنی دەفرۆشن. سەرۆک جاشەکان چەند سەد کەسێک ناونووس دەکەن و پارەکانیان وەردەگرن، کەزۆربەی جار ئەوان تەنها پارەی چەند جاشێک دەدەن و ئەوی تریشی لەگەڵ فەرماندە سوپاییەکاندا بەش دەکەن. شەڕەکە بۆتە سەرچاوەی نان پەیداکردن بۆ هەندێکیان. هەربۆیە هەتا ئەو کاتەی ڕژێمی سەربازی حاکم بێت، کڕین و فرۆشتنی چەک و تەقەمەنیش

بەردەوام دەبێت.

لای ئێـوارە گـەڕاینەوە بۆ ناوپردان. من و عـەلی سنجـاری بڕیارمـان دا جارێـکی تریش بەرێگای ڕەوانـدز - حاجی ئۆمـەراندا بڕۆین، ئەم جارەیان بۆ ئەوەی لە ڕەوشی ئەو چەند خـێـزانە بکۆڵیـنەوە کـە پەنایان هێنابوو بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی شۆڕش.

## پاشماوەی ئێستگەیەکی رادیۆ

رۆژی یەکشەممە رێکەوتی ٢٠ی ئاب گەراینەوە بۆ گوندی رێزانۆک و پاشان بەرەو جێگای پاشماوەی محەتەی رادیۆی دەنگی کوردستان، کەوتینە رێگا. محەتەی رادیۆکە یاخود چاکتربڵێم پاشماوەکەی لە ئەشکەوتێکدا بوو، لە بەرزاییەکی خوارووی رێگای رەواندز - حاجی ئۆمەران. هەڵگەراین هەتا گەیشتینە دەرگای ئەشکەوتەکە. بەرهەیوانێکی بچکۆلە لەبەردەمی ئەشکەوتەکەدا هەڵکەوتبوو، کە پێکهاتبوو لە سەربانێکی بەردینی سروشتی و دیوارێک کە تا سەربانەکە رۆیشتبوو. ئەم ژوورە بچووکە لەگەڵ ئەشکەوتەکەدا لە یەک درابوون و کونێکی بچکۆلەیان لەبەیندابوو.

لەم شوێنەدا هەموو ستافی (دەنگی کوردستان) کارەکانیان بەرێوەدەبرد، هەتا هێرشە گەورەکەی ئەم دواییە، ئەوەبوو دەنگی کورد خامۆشکرا و هەموو شتەکان گواسترابوونەوە بۆ شوێنێکی تر، لە لاپەرەکانی دواتردا باسی لێوەدەکەم.

هەر لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا، جێگای ئەو گوللە و بۆردومانانەی رژێم دەبینران کە کردبوویانە سەر رادیۆکە. دوو دانە لە جێگایی گوللەکان هێندە قووڵ و گەورە بوون ئاوی لە زەوییەکە هەڵقولاندبوو و گۆلاوی بچکۆلەیان دروستکردبوو. لەسەر شاخەکە کە سەربانی ئەشکەوتەکەش بوو، جێگای بۆمبا دەبینران، بەلام پێ دەچوو هێندە بەهێز نەبوویبوون تا بتوانن سەربانە دە مەتر بەرزەکەی سەر محەتەی رادیۆکە هەڵوەشێنن. جێگای رادیۆکە بەدژواری بەبۆمبای ناپالم بۆردومان کرابوو بەشێوەیەک کە سەربان و شوێنی چوونە ژوورەوەی بەتەواوی وەکو خەڵوزیان لێ هاتبوو. ژمارەیەکی زۆر پارچە ئاسن کەهی بۆمباکان بوو بەهەرچواردەوری محەتەی رادیۆکەدا بلاوبووبوونەوە. یەکێک لە بورجەکانی رادیۆکە هێشتا لەوێ مابوو. وەکو عەمودێکی رەش بەرەو ئاسمان هەڵچووبوو.

عەلی سنجاری کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەو هێرشەدا نەجاتی بووبوو، ئەو بەرهەیوانەی نیشان دام کە وەکو قاقنەزی لێ هاتبوو، وتی: کاتی بۆردومانەکە خۆم هەڵدایە ناو ئەو ڕێڕەوە بچووکەی کە دەکەوێتە بەینی دیواری هەیوانەکە و سنگی شاخەکە. موعجیزەیەکە بۆ خۆی کە ئاگرەکە بەر من نەکەوت. ئاگرێکی وا کەوتەوە لەو باوەڕەدابووم کە هەموو شاخەکە بتوێنێتەوە. لەو ماوە کورتەی نێوان دوو هێرشدا توانیم خۆم بگەیەنمە لای هاورێکانم لە ئەشکەوتە گەورەکەدا. خۆمان لە دەوری کلاورۆژنەکە کۆکردبووەوە بۆ ئەوەی بەدوکەڵ نەخنکێین. ئەمە لە دوا ڕۆژدا ڕوویدا، پێش ئەوەی بورجەکە و ئەو جەنراتۆرەی کە بەبەنزین کاری دەکرد تێک بشکێنرێن. پاشماوەی کەلوپەلەکانمان، سێ دانە نێرەری ڕادیۆ کە لەسەر سێ شەپۆلی جیاواز کاریان دەکرد، هەموو کەلوپەل و دەزگاکانمان بەتەسجیل و گرامافۆن و بەرنامەی تەسجیلکراو و قەوانی گرامافۆن و هتد، هیچ زیانێکیان پێنەگەیشتبوو، بەڵام پێویست بوو هەرچی زووترە لەم ئەشکەوتە بیانگوێزینەوە.

لە چەند سەد مەتری سنووری ئێران جێگامان ئامادەکردووە. فڕۆکەکانی عێراق چیتر ناتوانن هێرشمان بێننە سەر(مەبەست بۆ سەر ڕادیۆیە) لەبەر ئەوەی ئەوان مەترسی ئەوەیان هەیە کە بۆمبەکانیان بکەوێتە ناوچەکانی ئێرانەوە.

بەزەردەخەنەیەکەوە عەلی وتی: لەڕاستیدا ئێمە دەست ناخەینە ناو کاروباری بەغدا و تاران، لە ئیحتیمالی هاتنە پێشی دەمەقاڵەی ئەو دوو وڵاتە. ئێمە تەنها ڕادیۆ کوردییەکەی خۆمان دەپارێزین.

هەموو ڕۆژێک مەوجەکانمان دەگۆڕین، لەگەڵ ئەوەشدا پاش ماوەیەکی کورت دەگەنە سەرمان. بلاوکردنەوەی نیوکاتژمێر بەرنامە هەموو ڕۆژێک، کافییە بۆ ئێمە: ئەو سەربازە بەختەوەرانەی کە ڕادیۆیەکی بچووکیان هەبێت دەتوانن گوێ لەدەنگی کوردستان بگرن، پێش ئەوەی دەستگا

تەشویشەکەی بەغدا موزیک و قسەکانمان لەو ئاوازە ئەمەریکاییە بەناوبانگەی کە دەڵێت" ماچم کە ئەزیزم، ئەزیزم ماچم کە Kiss me honey, honey kiss me" نقوم بکات.

لە پاڵ ئەم ئاوازە ناسراوە لەلای کورد، ڕژێمی عێراق سیاسەتێکی ڕیاکارانە بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی بتوانێت کورد بەلای خۆیدا ڕابکێشێ بەوەی کە ڕۆژانە شەش سەعات موزیکی کوردی بڵاودەکاتەوە. لە ڕاستیدا ئێمە گوێ بۆ بەرنامە کوردیەکانیان ڕادەگرین، بەلام کەس باوەڕ ناکات بەوەی کە دەیڵێن. تەنها ڕادیۆیەک کە ڕاستی بێژ بێت و بەکەڵک بێت لەلای ئێمە، ڕادیۆیەکی غەیرە عەرەبیە، ئەویش ڕادیۆی ئیسرائیلە. ڕادیۆی ئیسرائیل لەناو گوێگری عەرەبیشدا ڕەواجی زۆرە، هەربۆیەشە ڕژێمی عێراق ناوێرێت پەخشەکەیان تێک بدات بەموزیک یان شێوەی تر. لە ڕاستیدا " حەقیقەت بەسەر هەواڵە هەڵبەستراوەکاندا سەر دەکەوێت".

من بەباشی لە کاریگەری بۆمبە ناپاڵمەکان گەیشتم پێش ئەوەی محەتەی کاولکراوی ڕادیۆ کوردیەکە بەجێ بهێڵم. بەدرێژایی دۆڵی حاجی ئۆمەران، لە هەردوو بەری ڕووبارەکەدا ئەو خێزانە ئاوارانەم دەبینی کە خەریکی گێرەکردن بوون. کاتێک محەتە کاولکراوەکەم بەجێ هێشت، داوەتیان کردم کە سەردانی ئەو جێگا نوێیە بکەم، کە لە بەشێکی تری ئەم ڕاپۆرتەدا باسی دەکەم.

## گوندی بۆمبارانکراوی گەلاڵە

ئەشکەوتە سووتاوەکانمان لەدوای خۆمانەوە بەجێ هێشت و بەرەو لای لۆریەکەی کە عەلی سنجاری بەکرێی گرتبوو، چووین. سەیارەکەمان بەرەو گەورەترین گوندی دۆڵی حاجی ئۆمەران-ڕەواندز، واتە گەلاڵە تاژۆتی، کە لەلایەن کوردەوە پێی دەوترا «شارە چکۆلەکەمان».

لە گەلاڵە بازارێکی بچکۆلانەی لێ بوو، ئەو کەرستانەی لێ دەفرۆشرا، کە بەقاچاخ لە ئێران و عێراقەوە دەهێنران. ڕەنگە خوێنەران بەلایانەوە سەیر بێت کە بۆچی کەلوپەلی عێراقی وەکو قاچاخ چاوی لێ دەکرا. وەلامەکەی ئاسانە. ئەو ناوچانەی کە لەلایەن سوپای شۆڕشگێری کوردەوە کۆنترۆل دەکرێن، لە ژێر باری ئابلوقەیەکی ئابووری سەخت دان. ئەیان دەهێشت هیچ کەلوپەلێک لە سنووری بەتوندی کۆنترۆل کراوی کورد و عێراقی دەرباز ببێت، سوپای عێراقی بەئاسانی چاوەدێری ڕێگاوبانە گەورەکانی دەکرد کە ناوچە کوردییەکانی بەو ناوچانەوە دەبەستەوە کە دەکەوتە ژێر کۆنترۆلی دەوڵەت. تەنها چەند ڕێگایەکی بچووک و ڕێگای وڵاخدار هەبوون بۆ ناوچە کوردییەکان. دەوڵەت بۆ ئەوەی بتوانێت ئابلوقەکەی بەرتەسک تر بکاتەوە چەندین جار بڕیاری دەست بەسەرداگرتنی گوێدرێژ و وڵاخی باربی تری دابوو. بۆ خوێنەرێکی سوێدی کارێکی لەو جۆرە پێکەنین ئامێزە کە بڕیاری دەرکردنی گرتنی ئاژەڵ بدرێت، بەلام بۆ ئەو ئاژەلانە و خاوەنەکانیان تراژیدیا بوو.

ئەو دووکانە فەقیرانەی بازاڕی گەلاڵە، بەقوماشی نالا و والا تابلۆیان دروست کردبوو. سێ چوار چاخانەشی لێ بوو، کە کورد بەخۆیان و جامانە ڕەنگاوڕەنگەکانیانەوە، چایان لێ دەخواردەوە و باسی سیاسەت و بازرگانیان تێدا دەکرد.

لە زۆر جێگا دانیشتووانی ئەو گوندە، بەژن و پیاوەوە، خەریکی

چاکردنەوەی خانوەکانیان بوون. مرۆڤ لێرەدا ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە کوردەکان بەدەوڵەمەند و فەقیریانەوە، هەمیشە بەکەرەستەی هەرزان خانوەکانیان دروست دەکەن، بەخشتی سوورەوەکراو. گەلێک لە ناوچەکانی کورد لەلایەن دەوڵەتەوە هەوڵی داگیرکردنیان دراوە، گەلێک لەو خانوانە دیوای دەرەوەیان ڕووخابوون، هەر ئەمە وایکردووە کە ئەتواترێت بەکەرەستەی باش خانووەکان دروست بکەن. شەڕی ئەم دواییە نموونەیەکی باشە بۆ ئەو کاولکارییە درێژخایەنە، کە لە سەردەمی ئینگلیزەکانەوە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە دەستی پێکردوە و ڕژێمی بەغداش درێژەی پێدەدا.

لیستەیەک لەو سەدان گوندانەی کە کاول و وێران کرابوون نێردرابوون بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتووەکان و کۆمیتەی خاچی سووری نێودەوڵەتی. بەداخەوە تا ئێستا ئەو ڕێکخراوانە نەیانتوانیوە شتێکی بەرچاو بکەن بۆ پاراستنی ژیان و موڵک وماڵی ئەو خەڵکە، لەو دەڤەرانەی کە بەشێوەیەکی فەرمی دەکەونە بندەستی سەردارێتی دەوڵەتی عێراق.

## ئەو پەناهەندانەی کێوەکان دەیانپارێزن

لە کاتی گەڕانەوەدا سەردانی ئەو خێزانە ئاوارانەم کرد کە لەژێر دار و درەختەکاندا ژیانیان دەبردە سەر، لە دۆڵی حاجی ئۆمەران ـ ڕەواندز. نازانم بەچ زمانێک باسی ئەو هەژارییەی کە دووچاری ئەو ناوچانە بووە بکەم. لەگەڵ باری ژیانی نالەباری ئەو خەڵکانەی کە ئەوە پێنج شەش ساڵ دەبێت بەو شێوەیە ژیان بەسەر دەبەن.

زۆر لەو ژن و منداڵ و پیرانە خزمی ئەو پێشمەرگانەن کە لە ڕیزی سوپای شۆڕشگێڕی کورد دا خزمەت دەکەن. لە ڕاستیدا زۆربەیان هەموو سەروەت و سامانێکیان لە دەست داوە. ئەو ئاوارانە لە هەوڵی ئەوەدان کە لە نزیک بنکەی سەرکردایەتی کۆمیتەی ڕاپەڕاندن و بارەگای ژەنەراڵ بارزانیدا بن، بۆ ئەوەی نانی ڕۆژانەیان بدەنێ تاکو بتوانن بژین. زۆر لە پیرەکان و ژنان ڕێگایەکی دوور دەبڕن تا خۆیان بگەیەننە بارەگای ژەنەراڵ بارزانی و ڕاستەوخۆ لە دەستی خۆیەوە بەشی ڕۆژانەی خۆیان وەربگرن. بارزانی بۆ خۆشی هاودەردی خۆی لەگەڵ ئەو خەڵکە هەژارەدا دەردەبڕی و، بەوەی کە لەماوەی ئەو شەش ساڵەدا ژیانێکی سەختی بەسەر دەبرد. ژەنەراڵ بارزانی بۆ خۆی لە ئەشکەوت و خێمە و کەپر و خانووی گڵیندا ژیان بەسەر دەبات، هەر وەکو ئەو پەناهەندە هەژارانە.

لە نزیک پردی حافز، کە بەبۆمبا تێک و پێک درابوو و تەنها چوارچێوە ئاسنەکەی مابوو، چاوم بەژن و پیاوێک کەوت خەریکی تەختکردنی جێگایەک بوون لە قەراخ گردێکدا. کە لێیان نزیک بووینەوە، عەلی سنجاری باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەوانە ژن و مێردێکن خەریکی دروستکردنی خانووبەکن بۆ زستان بۆ خۆیان و منداڵەکانیان.

کاتێک ویستم وێنەیەکی ژنەکە بگرم، دەموچاوی خۆی شاردەوە. قەناعەتمان پێکرد کە بتوانین وێنەیەکی بگرین، بەڵام بەداخەوە سەرکەوتوو

ئەبووین، بەشێک بەهۆی جلە دڕاوە خاکیەکانی بەریەوە کە فەرقی نەبوو لەگەڵ ڕەنگی ئەو جێگایەی کە خەریکی خانوو دروستکردن بوون لێی، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی و منداڵەکانی لە سەرمای زستان لێ بپارێزێ.

کچ و کوڕێکی پێنج شەش ساڵەمان بینی کە لە ناو دارەکانی دارستانەکەوە سەریان دەرهێنا. پرسیارم لە باوکیان کرد کە ئاخۆ دەتوانم وێنەی خانووەکەیان کە کەوتبووە ژێر چەند درەختێکەوە، بگرم، بەڵام ئەو بەدەم کێڵانی زەویەکەیەوە بەخاکەناسەکەی دەستی وتی: «بۆچی وێنەی ئێمە دەگریت، تۆ ناتوانیت لە جیاتی ئێمە وێنەی پێشمەرگەکانمان بگریت؟» دەستی بۆ عەلی سنجاری و حەرەسەکەی کە بەخۆی و جانتاکەیەوە بەدوامانەوە بوو، ڕاکێشا.

بەرەو لای کەپرە هاوینییەکەی ئەو خێزانە چووم کە خەریکی کوڵاندنی گەنم بوون، دوای ئەوەی کە لە بەر خۆر وشکی دەکەنەوە دەیهاڕن و دەیکەن بەساوەر، کە خواردنێکی خۆماڵی کوردییە. دایکەکە، فەرشێکی بەقەدی دوو دارەوە گرێ دابوو، کردبووی بەجۆلانە بۆ بچوکترین ئەندامی خێزانەکەیان کە منداڵێکی سێ چوار مانگی بوو. منداڵە گەورەکەیان، ئاقڵانە بەدوام کەوت بۆ لای کەپرەکەیان، لە کاتێکدا کە دایک و باوکەکەی خەریکی کاری خۆیان بوون.

ماڵ و سەروەتی ئەو خێزانە پێک هاتبوو لە یەک دوو لێفە و بەڕەی دڕاو و چەند قاپێکی زەرد هەڵگەڕاو، سەماوەرێک و چەند کوپێک و چەند کیسەی بچووک کە ساوەر و ئاردیان تێکردبوون.

بە سەدان خێزانی تر کە لە هەمان بارودۆخدا دەژیان، لە خوارەوەی ئەو ڕێگایەی حاجی ئۆمەران - ڕەواندز، دەبینران. سەرچاوە کوردییەکان دەڵێن کە دوو سەد هەزار کورد پەنایان بۆ ژێر دەسەڵاتی سوپای شۆڕشگێری کورد هێناوە تا بیانپارێزن. دەبێت ئەوەش بوترێت کە پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکات، کوردستان دەوڵەمەندترین و بەپیت و بەرەکەت ترین بەشی ئەو

ولاتە بووە. پێشتر زۆربەی ئەو خێزانانە لە گوندەکانیان، بەکاری کەشاوەرزییەوە خەریک بوون و ژیانێکی بەقیمەت هەبووە کە شایستەی مرۆڤ بێت. بەروبوومی وەرزێرەکان کە پێک هاتبوو لە گەنم و جۆ و توتن و میوە و... هتد بەشی ئەوەی دەکرد کە بەچاکی خۆیان و بەشێکی گەورە لە دانیشتوانی عێراقی پێ بژێنن.

گەلێک لە ڕووناکبیرانی کورد بەئارەزووی خۆیان لەو پەیوەندییە کوردی-عەرەبییەی کە هەبووە خۆیان گونجاند و خزمەتێکی زۆری ئەو دەوڵەتە تازە بنیاتنراوەیان کردبوو. هەموو ئەمانە ئێستا بوون بەکەلاوە، سەدان هەزار وەرزێری کورد بەزۆر لەسەر گوندەکانیان دەرکراون، هەموو ڕووناکبیرانی کورد لەسەر کارەکانیان دوورخراونەتەوە. هەموو گەلی کورد ناچارکراوە کە لەژیانێکی ناخۆشدا بژین.

ئەم هەموو خەڵکە لەلایەن سەرۆکی عێراقەوە وەکو پێشمەرگە چاویان لێ دەکرێت و، بانگەشەی ئەوە دەکات ئەگەر بگەڕێنەوە دەیانبەخشێت. لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بۆمان دەردەکەوێت کە چی لەوانە دەکەن کە دەگەڕێنەوە بۆ لای ڕژێم. منداڵانی کورد لە کوردستاندا، لەماوەی ئەم شەش ساڵەدا نەیانتوانیوە بچنە قوتابخانە. بەشێک لە کوردستان کە جارێک لەجاران زیاتر لە ملیۆنێک کەسی لێ دەژیا، ئێستا یەک قوتابخانەی تێدا نییە. کەم خۆراکی و مەلاریا و نەخۆشی سیل ناوچەکەیان داگیر کردووە. ڕژێمی بەغدا ئەمبارگۆی دەرمانی خستۆتە سەر کوردستان. هەموو ئەو پەناهەندانە و ئەو بەشەی کوردستانی ئازادکراو، تەنها چوار دوکتۆر و چوار خانووی لە قوڕدروستکراوی لێیە کە کراون بەخەستەخانە.

## بەڵام کێشەی کورد هەروەکو خۆی ماوەتەوە

هاوڕێکانم گوتیان لەو پرۆگرامەی عێراق ڕاگرتبوو کە ئێوارەی ڕۆژی یەک شەممە ٢١ی ئاب، لە ڕادیۆی عـێـراقـەوە خـوێندرایەوە. ڕژێمی عـێـراق بەشێوەیەکی گشتی، داوای لە هەمـوو هاوڵاتیانی عێراق دەکرد کە یەک بگرن و داوای دەکـرد کـە کـورد و عـەرەب وەکـو برا بن. هاورێکانم زۆر نیگەران بوون لەو پەیامەی عێراق کە هەر قسە کۆنەکانی کاوێژ دەکردەوە و هیچ شتێکی تازەیان پێ نەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕژێم بڕیاری دابوو کـە داخـوازیەکـانی گـەلی کـورد بپەژرێنێ. بەڵام مەبەسـتی ڕژێم چی بوو لە داخوازیەکانی گەلی کورد، لە بەیاننامەکەدا رون نەکرابووەوە. چەند دەقەیەک دوای ئەوە، ئەو برادەرەی کـە لە ژوورەکـەدا لەگـەڵم دەمـایەوە، حـەسـەن حـەیدەر، گـوێی لەو هەڵسـەنگاندنە خێرایەی ڕادیۆی ئیـسـرائیلی گرت، لە مەڕ ئەو بەیانەی کە عـێـراق دەریکردبوو. ڕادیۆکە باسی هێلی سیاسـەتی سـەرۆک وەزیرانی وەلانراو بەزازی دەکرد، کـە خـەتێکی نەرم تر و ڕیالیسـتـانەی هەبوو بۆ چارەسەری کێشەکە. ڕژێمی تازە وای نیشـان دەدا کە ئەوان پەیڕەوی لەو دوازدە خاڵەی کە بەزاز دایناوبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، دەکەن. بەڵام باسی ئەو پێنج ملیۆن دینارەیان نەکرد کە ڕژێم بڕیاری دابوو بۆ چاک کـردنەوەی ئەو ڕێگا و بانانەی کـە ڕژێم بۆردومـانی کـردبوون وخـراپی کردبوون، ئەم بڕە پارەیە کە دەیکردە مەسروفـاتی چەند ڕۆژێکی سوپای عێراق، بۆ هەموو "باکور" واتە کوردسـتـان تەرخان کرابوو. ڕژێم لە ئێستاوە دەستی کردبوو بەچاکردنەوەی ڕێگا سەربازیەکان، ئەمەش کوردەکانی تووڕە کردبوو، چونکە ئەو ڕێگایانە بۆ هێرشە سەربازییەکانی داهاتووی عێراق چاک دەکـرانەوە. بەزاز یەکـەمین سـەرۆک وەزیری سـڤـیل بوو دوای

کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨. دوای ئەوەی کە لە هێرشە سەربازییەکەی بەهاردا شکستیان خوارد بوو، توانی ئەندامانی دەوڵەت کە هەموویان عەسکەری بوون ڕازی بکات بەوەی کە دان بنێن بەداخوازیەکانی کورددا، کە بریتی بوون لە ئۆتۆنۆمی کلتووری و ڕێکخراوەیی.

نزیکەی مانگێک پێش سەفەرەکەم بۆ کوردستان لە قاهیرە بووم، بەڕێکەوت بەزازیش لەوێ بوو کە بۆ سەردانی ناسر هاتبوو. بەزاز لە هۆتێلێک دابەزیبوو کە پەنجا مەترێک دوور بوو لەو هوتێلەی کە منی لێ بووم. ئەو شوێنە لە لایەن ژمارەیەکی لە ژمار نەهاتوو لە سەربازی میسری چاوەدێری دەکرا. بەسەیارەی ئاخیر مۆدێل دەیانهێنا و دەیانبرد. لە میوانداریەکی شایستەدا کە بۆ بەزاز ئامادەکرابوو وتی: ئێمە لەگەڵ کورد گەیشتووینەتە ڕێککەوتنی کۆتایی. ناسر لە لایەن خۆیەوە خۆشحالی خۆی دەربڕی و ڕێککەوتنەکەی بەرز نرخاند.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ بەغدا، بەزاز لە لایەن سەرۆک کۆمار عەبدولسەلام عارفەوە وەلانرا و لە جێگای ئەو (ناجی تالیب)ی دانا کە پیاوێکی عەسکەریی بوو. بەم شێوەی هاوڕێکانم گوێیان لەو بەیانە گرتبوو کە حکومەتەکەی ناجی تالیب دەری کردبوو، کورد زۆر لە ناوەڕۆکی ناڕوون و شاردراوەی بەیانەکە نیگەران بوون.

زۆر شت دەوترێت و دەکرێت، دەبێت بیر لە زۆر شتیش بکرێتەوە پێش ئەوەی بگەنە ڕێککەوتنی کۆتایی.

## رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق

رۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ٢٢ی ئاب سەردانی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی عێراقم کرد. خانووی ڕادیۆکە لە ئەشکەوتێکی دەستکرد دروست کرابوو، بەپێچەوانەی ئەو ئەشکەوتەی کە دوو ڕۆژ لەوەو پێش سەردانیم کردبوو. دوو دانە تونێل، بەبەرزایی مەتر و نیوێک و بەدرێژایی ١٥ مەتر تونێل بۆ ناو کێوەکە لێ درابوون.

سێ دانە نێرەر کە لەسەر سێ شەپۆلی جیاواز بڵاودەکرانەوە، دوو تەسجیل و گرامافۆنێکی لێ بوو. دیوارەکان بەکاغەز و نایلۆن داپۆشرابوون بۆ ئەوەی زیخ و خۆڵ نەکەوێتە خوارەوە بەسەر جیهازەکاندا، کە بەتەنیشت دیواری (قەراخی) کێوەکەدا دانرابوون. سێ دانە مۆتۆری کارەبایی کە بەبەنزین کاریان دەکرد لە نزیک ئەو شوێنەوە خرابوونە چاڵەوە. کابڵی ئەستوور لەو ماتۆڕانەوە ڕاکێشرابوون بۆ ناو ئەشکەوتەکە. لە نزیک ئەشکەوتەکەوە ئەنتێنی نێرەر لە قولەیەکەوە بەروە ئاسمان هەڵچوو بوو. چەند دۆشکەیەک و تۆپی سووک لە نزیک شوێنی ڕادیۆکەوە دابەسترابوون. بێجگە لەو گرووپە پاسەوانەی کە چاودێریی محەتەی ڕادیۆکەیان دەکرد، بیست کەسێک کە پێکهاتبوون لە خەڵکی ڕۆشنبیر و تەکنیککار ڕادیۆکەیان بەڕێوە دەبرد. سەیدا ساڵح یووسفی کە هەموو ژیانی خۆی بۆ پێشکەوتنی کلتووری کوردان تەرخان کردبوو، بەرپرسی ڕادیۆکە بوو.

سەیدا ساڵح یووسفی دەموچاوێکی زەعیف و جوانی هەبوو. لووتێکی ڕێکوپێکی هەڵۆیانە و چاوەکانیشی زیت. ئەو جلی خۆماڵی کوردی و کراسێکی سپی خاوێنی لەبەردابوو. دەمانچەیەکی بەقەددەوە بوو، پێ دەچوو تەنها لە بەر هەڤاڵەکانی تری کە چەکدار بوون هەڵی گرتبێت. دەنا سەیدا لەو کەسانە نەبوو چەک هەڵبگرێت تا بەهۆی ئەوەوە ڕێزی بگیرێت. دەنگی سەیدا لە هەموو کوردستاندا ناسراوە. کەم جار هەیە ئەو

پێشمەرگانەی کە لە ناو چیاکاندا دەگەڕێن و ڕادیۆکانیان لە تەک تاقم و تفەنگەکانیان دەبەستن، پرۆگرامەکەی سەیدا لە بیر بکەن.

سەیدا ساڵح یووسفی دەیگوت: ئێمەی کورد گەلێکی هەژارین. تۆ بەچاوی خۆت دەبینیت کە چ زەحمەت وقوربانیەک دەدەین تا بتوانین ئەم ڕادیۆیە دابنێین و گەلەکەمان بتوانێت بەزمانی خۆی گوێ لە خۆی بگرێت. من چەندین نامەم لە لایەن گوێگرەکانمانەوە بۆ هاتووە کە خۆشحاڵی خۆبان دەردەبڕن و سوپاسمان دەکەن کە دەتوانن گوێ لە زمانی کوردی و موزیکی کوردی بگرن. گەلێک لەوانە جگە لە زمانی کوردی هیچ زمانێکی تر نازانن. ئەوان دەتوانن لە ڕادیۆکانیانەوە گوێ لە چەندین زمان بگرن کە یەک وشەی لێ تێناگەن. بەدڵنیاییەوە تۆ تێگەیشتنت بۆ ئەوان هەیە، کاتێک ئەوان دەتوانن بەخۆشحاڵیەوە، گوێ لە زمانی خۆیان و موزیکی خۆیان بگرن. لە چەندین لاوە لە دەوروبەری ئێمە، زۆر بەتوندی قەدەغەیان لەسەر گوێ گرتن لە ڕادیۆکەی ئێمە داناوە. تێناگەم، چۆن بتوانرێت بەشێوەیەکی تەکنیکی ڕێگا لە خەڵک بگیرێت "بە دزیەوە گۆهداریمان" بکەن. بەدڵنیاییەوە، چاخانە و قاوەخانە و دوکانەکان، ناتوانن بەئاشکرا گوێ لە دەنگی کوردستان بگرن، دەنا ڕووبەرووی سزا دەبنەوە، بەبیانووی پروپاگەندەی ناپاساییەوە.

لەگەڵ ئەم کاردانەوە تاڕادەیەک ناکاریگەرەدا، ڕادیۆکەمان هەمیشە تەشویشی (من لە خەڵکم بیستووە کە پێیان وتووە " هانی هانی") ڕژێمی عێراقی بەدواوەیە. ئێمە بەتەواوی مەعناوە، خۆشارکێ دەکەین لەسەر شەپۆلە نادیارەکان. ئێمە شەپۆلەکان دەگۆڕین. کەچی ئەوان دیسان دوامان دەکەون. ئێمە خۆمان لەو شەپۆلانە نزیک دەکەینەوە کە دراوسێکانمان بەکاری دەهێنن، بەلام ڕژێم دیسان وەدوومان دەکەوێت و گوێ ناداتە ئەوانیش و دەنگی ئەوانیش خراپ دەکات. ئێمە لە کاتی جیاواز جیاواز دا بەرنامەکانمان بلاودەکەینەوە. ڕژێمی بەغدا بیست و چوار سەعات بەدوومانەوەیە بۆ ئەوەی ئەو دەنگە ئازادەی ئێمە، بەو ئاوازە ناخۆشانە

خامۆش بکات.

ئەی کەسێک کە لە هیچ زمانێکی تر تێنەگات چی بکات؟ ئایا دەوری کەڕ و لاڵ ببینێ؟ بەڵێ، ئێمە تووشمان بووە بەتووشی کەسانێکی سیاسییەوە کە هیچ تێگەیشتنێکی مرۆڤانەیان نییە و بەپشتیوانی لە یاسا نامرۆڤایەتیەکانیان نکۆڵی لە گرنگترین پەیوەندی مرۆڤانە دەکەن ئەویش پەیوەندی بەزمانی زگماکییەوەیە لەگەڵ هاوولاتیاندا.

لە کاتی شەڕدا، ڕادیۆکەمان بەبەردەوامی لە ژێر بۆردوومانی فڕۆکەکاندا یە. هەربۆیە خەتەری گیانە، ئەگەر لە نزیک محەتەی ڕادیۆکەمانەوە قەرار بگیرێت. ڕژێمی عێراق بەباشی جێگای ئێمە پێدەزانێت، کاتێکیش کە بەباشی خۆیان تەیارکردەوە بۆ هێرشی داهاتوویان، کام بۆمبای گەورە و گرانە بەسەر دەنگی کوردستاندا هەڵی دەڕێژن لەناو ئەم شاخە دا.

کە کاتی بڵاوکردنەوەی ڕادیۆکە تەواو بوو، چووین بۆ لای ئەو دوو کەپرە بچکۆلە و خێمەیەی کە دوو سەد مەترێک لەو لای مەحەتەکەوە بوون. لە یەکێک لە کەپرەکاندا مێزێکی نووسینی لێ بوو لەگەڵ چەند قەوانێک و چەند وەرگرێکی ترانسستۆر. دەنگی ئازادیی ڕادیۆی دەنگی کوردستان لێرەوە تێرِوانیینەکانی خۆی بەکوردی و عەرەبی ئامادە دەکرد، کە کاربەدەستانی ڕادیۆکە لە ڕادیۆی ولاتانی ترەوە وەریان دەگرت.

کەپرەکەی تریان وەکو عەمبارێک بەکار دەهێنا. بەشی چێشتخانەکەیان لە لایەن ژنێکەوە سەرپەرشتی دەکرا، برنج و شلەی بۆ لێ دەنایین. یەکێک لە کاربەدەستانی ڕادیۆکە خەریکی دروستکردنی زەڵاتە بوو. هەر کە چاوی بەمن کەوت بەگاڵتەوە چەقۆکەی برد بۆ لای دەمی و وەکو میکرۆفۆنێک دەستی کرد بەپروپاگەندە وەکو بێژەرێکی باشی ڕادیۆ: «هەلۆ، هەلۆ! ئێرە دەنگی کوردستانە، دەمانەوێت ئاگادارتان بکەینەوە بەگەیشتنی میوانێکی دوورە ولات کە لە لایەن کۆمیتەی سویدی _ کوردییەوە نێردراوە لە ستۆکهۆڵم. ئێستا خەریکی دروستکردنی زەڵاتەیەکی خۆشی کوردین بۆ

دوکتۆر ڕاستگەلدی. خوشکە ئایشێش خەریکی لێنانی برنج و ترشە لە نزیک ڕادیۆکەمانەوە. بۆ هەموو گوێگرەکانمان ئاواتی ئەوە دەخوازین کە نۆشی گیانیان بێت».

لەگەڵ کاربەدەستانی ڕادیۆی دەنگی کوردستان، نیوەڕۆ خوانێکی بەتام و چێژمان خوارد. ئێوارە لە ڕادیۆکەوە بیستم کە بەرەسمی باسی سەردانەکەی ئێمەیان کردووە. بەڵام ئەم جارەیان بەڕاستی و دروستی، کە لەلایەن سەیدا ساڵح یوسفییەوە نووسرابوو.

## بەهاری سەگەکان

دوای نان خواردنی نیوەڕۆ، سەردانی ئەو ڕەشماڵە کوردانەمان کرد، کە بڵاوبووبوونەوە بەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرزدا کە دەکەوتە ئاستی ۲۰۰۰ مەتر سەرووی دەریاوە. لە نزیک هەر ڕەشماڵێکەوە توتەڵە سەگی گەورە و، تووڕە کە دەیانحەپاند دەبینران. پێشمەرگەیەک وتی:«بەهاری دوایی، بەهاری سەگەکان بوو. سەگەکان خەتی بووبوون بەهۆی ئەو هەزاران کەلاکی حەیوانانەی کە لەئەنجامی بۆردومانی تەیارەکانی عێراقدا، کوژرابوون. بەڵام ئێستا دەبێت بەکڕانەوەی ئەو ئێسقانە گەورانە کە وشک بوونەتەوە ڕازی بن، کە لێرەو لەوێ وەکو تەپۆڵکەی بچووک لە کوردستاندا هەڵچنراون». خاوەن ڕەشماڵەکان سەر بەخێڵەکان نەبوون. ئەوان لە گوندەکانی خۆیان لەو سەر کێوانە دەژیان. ئەوان وەکو عادات لە هاویناندا لەنێو ئەو ڕەشماڵانەدا دەژیان.

ئەوان بەخۆیان و مەڕ و ماڵاتیانەوە هاوینان بۆ حەسانەوە ڕوویان دەکردە ئەم جێگایانە. ئەو زەویانەی کە ڕەشماڵیان لێ هەڵدەدا هی خۆیان نەبوو بەڵکو پارەیەکی کەمیان دەدا بەخاوەن زەویەکان تا بتوانن لێی بمێننەوە و هەمان کات دەبوو وەعدی ئەوە بدەن کە مەڕوماڵاتیان زیانە خۆری نەکەن. ئەم ئاژەڵدارانە وەکو عاداتێکی هەزار ساڵەی خۆیان، لە بەرهەمە گرنگەکانی خۆیان کە پێک هاتبوو لە گۆشت و کەرە و پەنیر و خوری و پێستە و هتد، بەشی دراوسێکانیان دەدا. ناتوانرێت هیچ کام لە نەتەوەکانی دراوسێی کورد لەگەڵ کورد بەراورد بکرێن کاتێک باسی ئاژەڵداری دەکرێت. سەرۆکەکانی عێراق لەوە تێنەگەیشتوون کە بەرهەمی ئەو ئاژەڵدارییە شتێکی بەنرخە بۆ هەموو خەڵکی عێراق، هیچ شتێک ناتوانێت قەرەبووی بکاتەوە. لە هێرشەکەی بەهاریاندا، سەربازانی عێراقی بەهەزارەها ئاژەڵیان کوشتبوو، کە پێویست بوو بکرێنە سەرچاوەی ژیانی دانیشتووانی ئەو وڵاتە. لە جیاتی ئەوە سەگ و داڵاش کردوویانەتە

جەژن لەسەر کەلاکی تۆپیوی ئەو ئاژەڵانە کە بەهەموو کوردستاندا بلاوبوونەتەوە.

من تا ڕادەیەک درەنگ گەڕامەوە بۆ بارەگای کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی. لە کەپرەکەماندا عەلی سنجاریم بینی کە پێی وتم: بەیانی دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆ لای من دەخۆین، حەزدەکەم موختەبەرێکی وێنە شتنەوە و کارگەیەکی چەک سازیت پێنیشان بدەم.

**میوانداریی عەلی سنجاری**

پێش نیوەڕۆی ڕۆژی سێ شەممە ٢٣ی ئاب، گفتوگۆم لەگەڵ چەند کەسێکدا کرد کە دووچاری ئازار و ئەشکەنجە هاتبوون لە زیندانی ڕژێمدا. هەروەها وێنەم گرتن.

دەوروبەری نیوەڕۆ عەلی سنجاری هات بەدواما و بردمی بۆ کەپرەکەی ماڵی خۆیان. ژنەکەی سنجاری عەرەبێکی خەڵکی مووسڵ بوو، تەمەنی ٣٠ ساڵ دەبوو. ئەم خێزانە سێ کچیان هەبوو کە تەمەنیان پێنج، حەوت و سێ ساڵ بوو، لەگەڵ کوڕە چوار ساڵیەکەیان. ئەوان لە بەینی خۆیاندا بەعەرەبی قسەیان دەکرد چونکە دایکیان کوردی نەدەزانی. کچەکان، بەو پەڕی ئەزاکەتەوە، منیان سەرگەرم کردبوو بەوەی کە ماوەیەکی کورت شیعریان بۆ دەخوێندمەوە و گۆرانیان بۆ دەوتم بەعەرەبی.

خانم سنجاری (هاوسەرەکەی عەلی سنجاری) تازەکی لە لایەن ڕژێمەوە گیرابوو لە شاری مووسڵ، لە پای کار و چالاکییەکانی مێردەکەی لە کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی لە شاخ. سوپا داوایان لە خانم سنجاری کردبوو کە ناونیشانی مێردەکەی بڵێت و ئەگەریش بکرێت بیهێنرێت بۆ لێپرسینەوە.

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دابوونەوە: «ئێوە چ پیاوێکن؟ یەکەم من تاوانبار دەکەن بەوەی کە مێردم بەکوردێک کردووە. پاشان بەمن دەڵێن بچم پیاوەکەم بێنم بۆ لێپرسینەوە. ئەوە ئێوەن کە دەبابە و تۆپ و تەیارەتان هەیە. ئەی بۆخۆتان ناتوانن بەو هەموو چەک و چۆڵانەتانەوە، بچن بیهێنن؟»

کچە گەورەکەیان کە دەچووە قوتابخانە و بەعەرەبییەکی جوان گۆرانی دەوت، ناچار ببوو لەلای هاوڕێکانی نەڵێت باوکی کوردە، تاکو توشی گیروگرفت نەبێت. دەمێک بوو منداڵەکان باوکی خۆیان نەدیبوو، هەربۆیە

شێوەی دەموچاویان لەبیر چووبووەوە.

ئێستا ئەوان توانیبوویان بێن بۆ لای باوکیان چونکە بۆ ماوەیەکی کاتی ئەمبارگۆ لەسەر ناوچە ڕزگارکراوەکان هەڵگیرابوو، خەڵکی سڤیل دەیانتوانی هاتووچۆ بکەن بۆ ناوچە کوردییەکان.

## تاقیگەی وێنەنوشتنەوەی شۆڕش

دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆمان خوارد، سەردانی موختەبەری شۆڕشمان کرد، کە لەلایەن وێنەگرێکی بەناوبانگی بەغدایییەوە سەرپەرشتی دەکرا. جێگای وێنە گرتنەکە لە پەنای چاخانەیەکەوە بوو، کە ئەو کوردانەی بیانویستایە وێنە بگرن کۆدەبوونەوە. وێنەگرەکە هەم بۆ خۆی و هەمیش بۆ شۆڕش کاری دەکرد.

ژووری شتنەوەی وێنەکان(ژووری تاریک) نزیکەی دوو مەتر دوجایەک دەبوو. دوو گڵۆپی سوور کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوون، ژوورەکەیان ڕووناک دەکردەوە. پرسیارم کرد کە لە کوێوە کارەبای ڕاکێشاوە بۆ گڵۆپەکان. بەپێکەنینەوە وەڵامی دامەوە: ڕاستەوخۆ لە خۆرەوە وەری دەگرم. پاشان گڵۆپە سوورەکانی نیشان دام کە لە دوو سەتڵی پلاستیک پێک هاتبوون، بەکونێکی کە لە دیوارەکەدا بوو چەسپێنرابوو. هەروەها دەزگای وێنە گەورەکردنەکەش هەر بەخۆر کاری دەکرد.

وێنەگرەکە کونێکی کردبووە سەربانەکە، کە بەسەرەتاپێکی دار دەکرایەوە. لە کاتی لەبەرگرتنەوەی وێنەکاندا، سەرتاپەکەی دەکردەوە تا تیشکی خۆر بەناو جیهازی گەورەکردنەکەدا تێ بپەڕێ.

کابرا ڕژێمی عێراقی تاوانبار دەکرد بەوەی کە دەستیان گرتووە بەسەر هەموو جیهازەکانی و خراپ کردنیان لە شاری بەغدا. هەروەها سویا کوڕە هەژدە ساڵەکەیان گرتبوو، ئەشکەنجەیان دابوو بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر باوکی بدات بەدەستەوە. کوڕەکەی کە ئێستا لەگەڵ باوکی دەژی، دووچاری نەخۆشی دەروونی بووە، زمانی دەیگرت و کاتێکیش کە بیویستایە قسە بکات دەستی دەکرد بەگریان. باوکی نەیدەویست زۆری لێ بکات بۆ قسە کردن بەڵکو ڕووی کردە من و وتی: ئێستا زۆر باشترە. ئەو بەستەزمانەیان ماوەی چەند هەفتەیەک ئەشکەنجە دابوو. ئەو لاواز و بێ

حەوسەڵە بوو، کاتێک ئازادیان کرد توانای قسەکردنی نەمابوو. منداڵەکانی ترم کە سێ کچی بچکۆلەن کاتێک پاش دوو ساڵ لەیەک دابڕان بینیانەوە، نەیان دەناسیەوە. ئەوان لە دایکیان دەپرسی ئەو مامەیەی کە ماچمان دەکات باوکمانە».

وێنەیەکی کاکی وێنەگر و سێ منداڵەکەیم گرت، لەنزیک موختەبەری شۆڕش. ئەو وێنەگرە کە هونەرمەندێکی بەناوبانگ بوو، هەر کە باسی کەلوپەلەکانی دەکرد کە لە بەغدا خراپیان کردبوون، هەناسەیەکی هەڵدەکێشا.

## چەکی گەوران، کەرستەی یاریکردنی منداڵان

ڕۆژێکی تر دوو کـــوردم بینی لە نزیک وێنەگـــرەکـــەوە. ئەوانیش پێشمەرگەیەک و کوڕە تەمەن یازدە ساڵانەکەی بوو. ئەو منداڵە گچکەیە زۆر بەجدیی جلی پێشمەرگانەی لەبەر کردبوو، چەک بەشانەوە و هێدەک بەقەدەوە. وێنەیەکیانم گرت، کە شایەتی تراژیدیای کەمبوونی وانەی ئەخلاقی منداڵانی کـورد لەو تەمـەنی خـوێندنە، دەدات. ئەوان هیچ کـەرسـتـەیکی یاریکردنی تر جگە لە چەک و دەمانچـەی گـەورەکـان ناناسنەوە. لە مـاوەی ئەم پێنج سـاڵەی دوایدا، منداڵانی کـورد نەیان توانیوە وەکو هاوتەمەنەکانی خۆیان لە وڵاتانی تر یاری بکەن. ئەوان هیچ جۆرە وانەیەکیان نەخوێندووە، جگە لە هونەری توانینی خۆ ژیاندن لە دنیایەکی هەژاردا. چوونە خوێندنگا بۆ ئەوەی بتوانێت دوارۆژێک بۆ خۆت بەدەست بخەیت، شتێکی نامۆیە بۆ منداڵانی کورد. ئەمە ئەو سەختیانەیە کە لە داهاتوودا لە دوای شەڕیش یەخەی کوردستان دەگرێت.

ڕۆژێکی تر منداڵێکی ترم بینی کە یەدەگەکانی بۆ باوکی هەڵگرتبوو. ئەو هەمیشە بەدوای باوکیەوە بوو وەکو ئەوەی کە لەڕووداوی ڕووداوێکدا دستبەجێ یارمەتیی باوکی بدات.

## کارگەی چەک دروستکردن

دوانیوەڕۆی ٢٣ی ئاب سەردانی کارگەیەکی چەک دروستکردنم کرد لە کوردستان. ئەم کارگەیە نارنجۆکی لێ بەرهەم دەهێنرا. عەلی سنجاری بۆی باس کردم، کارگەی تریش هەن کە چەکی تر دروست دەکەن، بەڵام لەم شوێنەی ئێمەوە دوورن. دەیگوت ئەم کارگەی چەکانە دەبێت زۆر بەنهێنی بپارێزرێن. ئەو کارگەیەی کە " زۆر لە ئێمەوە دووربوو" دەبوو لە ئەشکەوتێک یانیش لەبن شاخێکدا بێت. ڕەنگە هەموو کەسێک، هەموو خانوویەک، ئەشکەوتێ، دەوەنێک لەم کوردستانە نهێنییەکی شاردبێتەوە.

ئەم کارگەی نارنجۆک دروستکردنەش یەکێک بوو لەو نهێنییانە. بەرهەمەکانی شاراوە نەبوون، بەڵام جێگاکەی بەتەواوی نهێنی بوو. کارگەکە لە خانوویەکی گڵێن کە لە شوێنێکدا بوو لە لای ڕێگای حاجی ئۆمەران ـ ڕەواندز، کە زۆر زیرەکانە شاردرابووەوە. لەم «کارگەیەدا» مەکینەیەکی تەراشکاری مامناوەندی لێ بوو کە مۆتۆڕێکی پێوە گرێدرابوو بەبەنزین کاری دەکرد.

کەرەستەی خاوی ئەم کارگەیە بۆڕی ئاسایی بوو. بەمەکینەی تەراشکاریەکە بۆڕیەکان بەپارچەی دە سانتیمەتری دەبڕدرانەوە. ئەم بۆڕیە باریکانە دادەتاشران بۆ نزیکەی یەک لەسەر سێ یان چواری ئەو ئەستوورایییەی کە لەسەرەتاوە هەیبوو بەدوو سانتیمەتر کە لەشێوەی بازنەی پەستێنراو دەچوون. دوای ئەوە شێوە و فۆرمێکی نوێیان بەبۆڕیە کورتکراوەکان دەدا، بەشێوەیەک کە دوو سەرقاپیان بۆ هەردوو سەری بۆڕیەکان دەکرد. پاشان لە شوێنێکی تر پردەکران لە مادەی تەقێنەرەوە، کە کورد لەو بۆمبایانەی کە ڕژێمی عێراق دەیباراندن بەسەر کوردستاندا و هەندێکیان نە دەتەقینەوە، دابینیان دەکرد.

باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەم بۆمبا خۆماڵیانە کاریگەری چاکیان هەیە بۆ

سەر سەنگەرەکانی عێراق. کورد سەربازە عێراقیەکانیان ناچار دەکرد لە سەنگەرەکانیاندا خۆیان حەشار بدەن، چونکە پێشمەرگە دەستێکی بالآیان هەبوو لە پێکانی سەنگەرەکانی سەربازە عێراقیەکاندا. تەنانەت فڕۆکەکانی عێراق و تۆپخانەکانیان نەیان دەتوانی سەنگەرەکانیان بپارێزن.

ئەو تاکتیکەی کە پێشمەرگەی کورد بەکاریان دەهێنا، خۆیان نزیک دەکردەوە لە سەنگەرەکانی دوژمن بەشێوەیەک فڕۆکەکان ناچار بوون هێرشەکانیان بوەستێنن، ئەوەک زیان بەهێزەکانی خۆیان بگات. پێشمەرگە باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەوان زۆر کەڵک لەو بۆمبا خۆماڵییانە وەردەگرن، بەتایبەتی لە شەڕی دەستەو یەخەدا.

کابرای تەراشکار، چەندین دانە لەو بۆمبانەی نیشان داین کە بەو بۆڕیە ئاسایی و سادانە دروستیان کردبوون. بەلاّم ئەیان دەویست کە ئەو نهێنییەی کەچ جۆرە پلیتەیەک بەکار دەهێنن، کەشف بکەن.

ئەوەی کەمن لێی حاڵی بووم ئەوە بوو، هیچ کاتێک ئەو بۆمبایانە لە کاری تیرۆریدا بەکار نەهێنرابوون، چونکە کاری تیرۆری لەلایەن کوردوە وەکو کارێکی نائەخلاقی و قێزەون چاوی لێ دەکرا. جگە لە شەڕ لەگەڵ سوپادا، کورد هەندێک چالاکیان دەکرد کە بەشێوەیەکی زۆر ورد بەرنامەڕێژیان بۆ دەکرد لەدژی کارمەندە دڵ ڕەقەکان و ئەو خائینانەی کە بەرەچەڵەک کورد بوون.

## گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کوردانەی ئەشکەنجە درابوون

دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، چاوپێکەوتنم لەگەڵ یەک دوو لەو کوردانە کرد کە پێشتر لە زیندانەکانی ڕژێمی بەغدا دا، ڕووبەڕووی ئەشکەنجە کرابوونەوە. ژمارەیەکی زۆر ئەشکەنجە درابوون و جۆری ئەشکەنجەکانیش زۆر بوون.

هەر بچوومایە بۆ بارەگای کۆمیتەی ڕاپەڕاندن، دەیان زیندانییان نیشان دەدام کە لە گرتووخانەکانی عێراقدا ئەشکەنجە درابوون.

پێ دەچوو سەرکۆمار عەبدولسەلام عارف لە بیری چووبێتەوە کە لە سەردەمی بەعسییەکاندا بۆ ماوەیەکی کورت سەرۆکی دەوڵەت بووبوو.

بەماوەیەکی کورت دوای ڕووخانی بەعسییەکان، کتێبێکیان چاپ و بلاوکردەوە بەناوی "المنحرفون". لەو کتێبەدا باسی چەندین جۆر ئەشکەنجەی نامرۆڤانە کرابوو، کە بەعسییەکان کردبوویان. دوای ئەوەی کە سەرکۆمار توانی ئەو بەعسیانەی کە دژایەتیان دەکرد دووربخاتەوە، کتێبەکەی قەدەغە کرد.

## بەراوردکردنی کارەساتێک بەکارەساتێکی تر

ئێــوارەی هەمــان ڕۆژ هەواڵی ئەو بومــەلەرزە گــەورەیەم بیــســت کــە لە ڕۆژهەلاتی تورکــیــا ڕوویدابوو. پاشــان لە زۆر ڕۆژنامــەدا دەربارەی ئەو یارمەتییە مرۆڤانەیەی کە لەلایەن ڕێکخراوە مرۆڤ دۆستەکانەوە بۆ ئەو ناوچەیە تەرخان کرابوو، خوێندمەوە. کــورد هەســتــیــان بەهاودەردی دەکرد لەگەڵ قوربانییەکانی ئەم کارەساتە سروشتییە، نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەوان هیچ ئیــمکانێکیــان نیــیــە یارمــەتی هاوســێکانیــان بدەن لەو دیو سنووری تورکــیاوە. ئەو بێ دەسەلاتیــەشیان بەو بارە نالەبارەی خۆیانەوە گرێدەدا کە لەماوەی ئەو شەش ساڵەدا دووچاری هاتبوون.

هەروەها ڕوداوێکی تر کــە لەلایەن ڕاگــەیاندنی ڕۆژئاواوە ســەرنجی بۆ ڕاکێشرا، پەیدابوونی نەخۆشی کۆلێرا بوو کە لە ناوچەی هەولێر دۆزرایەوە. هەموو هەولێک خرایە کار بۆ ئەوەی ڕێگا لە بلاوبوونەوەی بگیرێت. بەلام سەرکــوتکردنی کــورد بەو شێوە وەحــشــیــانەیە و شالاوی لەڕەگ وریشــە هەلکێشــانیــان هیچ هاودەردیەکی لەگەڵ دەرنەبردرا، یاخود هەلــمەتێکی هاوکــاریــیــان بۆ نەخرایەگــەڕ. چونکە کــورد لە ناو عــێراقــێکی ســەربەخــۆدا دەژین، بۆیە نــازارەکــانیــان وەکــو کــێشــەیەکی ناوخــۆیی ئــەو ولاتە چاوی لێ دەکرێت.

## نەخۆشخانەکەی دوکتۆر حەسەن ساماواری

ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ٢٤ی ئاب، سەردانی نەخۆشخانەکەی ناوبردانم کرد کە لەلایەن دوکتۆرێکی عەرەب بەناوی دوکتۆر حەسەنەوە سەرپەرشتی دەکرا.

لە ماوەی ئەوە شەڕە دووروودرێژە بێ مانایەی لەدژی کوردان، ژمارەیەکی زۆر عەرەب بەشداریان لە خەباتی کورداندا کردبوو یاخود بەشێوەی جیاواز پشتیوانیان کردبوون. دوکتۆر حەسەن یەکێک بوو لەوانە کە بۆ دوو ساڵ دەچوو لە نەخۆشخانەی کورددا کاری دەکرد. لە هەموو ئەو ناوچە ئازادکراوە کوردیانەی کە ملیۆنێک خەڵکی لێ دەژی، لەم کاتەدا تەنها چوار دوکتۆریان هەیە، ئەوانیش دوکتۆر تاهیر بابان، حیکمەت حەکیم، حەسەن ساماواری (لەوانەیە: سامەڕایی- ئاراس) و ئەحمەد سالح.

ئەم خەستەخانەیە کە لە نێوان چەند دارێکی گەورەدا هەڵکەوتبوو، زۆر لە جادەی حاجی ئۆمەران ـ ڕەواندزەوە دوور نەبوو. ژوورێکی گڵێن وەکو ژووری چاودێری کردن، ژوورێکی دەرمان کردنی برینداز و عەمبارێک، ساڵۆنێک کە جێگای دە قەرەوێڵەی تێدا دەبووەوە و چێشتخانەیەکیش لە تەنیشت خەستەخانەکەوە بوو. شوێنی خۆشتن لەو جێگایەی کە ناوی لێ دەهاتە خوارەوە، ئەویش کانییەک بوو کە هەمیشە ئاوێکی سازگاری لەبەر دەڕۆیشت و سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەش بوو، هەروەها جێگایەک بۆ فڕێدانی پیسایی. پاشان بەوردی باسی هەمووی دەکەم. بەڵام با جارێ سەرێکی جێگای بینینی نەخۆشەکانی دوکتۆر بدەین.

ژووری فەحسکردن و بینینی نەخۆش لە ژوورێکی پێنج مەتر بەسێ مەتر پێکهاتبوو. کەلوپەلەکانی ناو ژوورەکە پێکهاتبوو لە دوو مێز، دوو کورسی، کورسییەکی درێژ و کتێبخانەیەک. ئەوەی ڕاستی بێت، قەرەوێڵەیەکی لێ نەبوو کە لە قەرەوێڵە بچێت بۆ ڕاکشان. سەکۆیەک لە

تەنیشت دەرگاکەوە، بۆ ئەو مەبەستە دروست کرابوو. ئەم سەکۆیە یەک دوو بەتانی خاچی سووری لەسەر ڕاخرابوو لەگەڵ خاولییەک.

ژمارەیەکی زۆر نەخۆش ڕۆژانە ڕوویان دەکردە ئەو جێگایە، نزیکەی ٥٠ تا ١٠٠ کەس. دەوا و دەرمانیش لە دڵنەوایی کردن و قسەکردن و دەرزییەک و چەند حەبێک بەدەر نەبوو، ئەویش پەیوەندی بەجۆری نەخۆشییەکەوە بوو. زۆربەیان دەبوو بەچەند دەنکە حەبێک ڕازی بوونایە، چونکە ئەگەر بۆ هەر نەخۆشێک پاکەتێک حەبیان بدایە کە پەنجا یان سەد دانەی تێدابوو، ئەوا هەرزوو کۆتایی بەدەرمان دەهات.

جێگای تیمارکردن لە ڕاستیدا لە بەشێکی ئەو عەمبارە پێکهاتبوو، کە بڕیان دابوو بۆ ئەو مەبەستە.

سالۆنی نەخۆشخانەکە پێکهاتبوو لە جێگایەکی حەوت مەتر بەپێنج مەتر کە جێگای دە قەرەوێڵەی تێدا کرابووەوە. زۆپایەکی لە پۆڵا دروستکراو لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو. ئێستا قەرەوێڵەکانیان بردبووە دەرەوە، لە ژێر درەختەکاندا دایاننابوون.

زەحمەت بوو لەوە تێبگەیت کە چۆن ئەتوانرا جێگای دە نەخۆش لەو ژوورە بچکۆلەیەدا بکرێتەوە. دوکتۆر حەسەن وتی: بەڵێ «دەبێت جێگای دە قەرەوێڵە بکەینەوە لەو ژوورەدا، هەندێک جار دەبێت لە دە نەخۆش زیاتریش لەسەر ئەو قەرەوێڵانە بکەوین، جگە لەوە چارەیەکی ترمان نییە».

چێشتخانەکە کە پێکهاتبوو لە کەپرێکی بەگەڵ سەرگیراو، ئەو ڕۆژەی کەمن سەردانی ئەو شوێنەم کرد، داخرابوو. نەخۆشەکان کە بەو ناوەدا بەنێو دار و درەختەکاندا بڵاوبووبوونەوە، ئەو ڕۆژە لەلایەن کەسوکاریانەوە خواردنیان بۆ دەهات. جاری وا هەبوو مرۆڤ، هەموو کەسوکاری هەندێک لە نەخۆشەکانی دەبینی کە هاتبوون بۆ لای کەسە نەخۆشەکانیان، بەگوێرەی ئامۆژگاریەکانی دوکتۆر خواردنیان دەدانێ.

لە هەموو کوردستانی ئازاددا تەنها یەک دەرمانخانەی لێیە. ناتوانیت

هەموو عەمباری دەرمانی خەستەخانەکە لەگەڵ ئەو دەرمانانەی کە لەلای دوکتۆرێکی سویدی هەیە بەراورد بکەیت. دوکتور حەسەن لە ساڵی ١٩٦٦ دا بەرپرسی خەستەخانەکەبوو، ئەو کاتەی کە شەڕی هەندرێن دەستی پێ کرد. ئەو دەڵێت «ڕۆژانە نزیکەی پەنجا تا شەست بریندار مەدەنیمان بۆ دەهات کە بەسەختی بریندار بووبوون. دوای ئەوەی کە فەحسمان دەکردن و ئەوەی کە پێویست بوایە بۆمان دەکردن، داوام لە کەسوکاری بریندارەکان دەکرد کە خزمە بریندارەکانیان لە دەوروبەری خەستەخانە لە ژێر دار و درەخت و دەوەن و شاخ و داخەکاندا بشارنەوە. من بۆ خۆم دەومن بەدەوەن و بن دار بەبن دار و ئەشکەوت بەئەشکەوت سەردانی نەخۆشەکانم دەکرد. هەوڵم دەدا کە هەتا بتوانم بریندارەکان بەشێوەیەکی بەر بڵاو، بڵاوبکەمەوە ئەویش لەبەر ئەوەی ئەوەکا خەستەخانەکە تۆپێکی بەر بکەوێت کە لەلایەن فڕۆکەکانی هێزی هەوایی عێراقەوە بەبەردەوامی بەشەو و بەڕۆژ دەیانباراند بەسەر ناوچەکەدا و هەرچیەک کە زیندووبووایە یاخود زیندەوەری بپارێزایە ڕاویان دەکرا، تا بەکۆمەڵ خەڵک سەریان تیا بچێت.

لە کاتی شەڕەکەدا هیچ شتێکی گواستنەوەمان لە بەردەستدا نەبوو. زۆرجار چەند ڕۆژێکی دەخایاند تا نەخۆشەکان دەگەیشتنە خەستەخانەکە. زۆربەیان خوێنێکی زۆریان لە بەر دەڕۆیشت و بەواقوڕماوی، گەلێک جاریش بەبێ هۆشی دەگەیشتنە خەستەخانەکە».

هەندێک لەو بتڵە دەرمانانەی پیشان دام کە لە خاچی سووری سویدییەوە بۆیان نێردرابوو وتی «ئێمە ژیانی گەلێک نەخۆشمان لە مردن ڕزگار کردووە لە ڕێگای ئەوەی کە شلەی جێگاگرتنەوەی خوێنمان تێدەکردن. لە کوردستان بەشێوەیەکی ئاسایی، باسی خوێن گۆڕین هەر نییە. ئێمە ئەو ماددە دروستکراوەمان دەکردە نەخۆشەکانەوە، کە لە دوای خوێن چاکترینیانە. بەو شێوەیە چەندین کەسمان لە مردن ڕزگار کردووە. من وەکو کەسێکی بێ دەسەڵات وابووم لەبەردەم ئەو بریندارانەی کە سک

و قەفەسەی سنگیان بریندار بوو بوو، بەڵام تاڕادەیەک دەمتوانی یارمەتی ئەوانە بدەم کە دەست و لاقیان یاخود لەشیان بریندا بوو بوو. لە سەرەتادا هەوڵم دەدا کە خوێنەکەیان بگیرسێنمەوە و برینەکانم پاک دەکردنەوە و بۆم دەپێچان و هەوڵم دەدا کە لە شوێنێکی پەنهاندا خۆیان بپارێزن تا لە فڕۆکەکانی دوژمن بپارێزرێن کە هەمیشە بەسەر سەرمانەوە گڤ وهۆڕیان بوو.

یەکەم شەپۆلی بریندارەکان زیاتر خەڵکی سڤیل بوون، دوای ئەوە پێشمەرگە بریندارەکانیان لە بەرەکانی شەڕەوە دەگواستەوە، چونکە کاتێکی زۆرتری دەویست بۆ گواستنەوەی ئەوان.

ئەو پێشمەرگانەی کە بەبریندارى دەکەوتنە دەست سوپای عێراقییەوە، هیچ هیوایەکیان بەژیان نەبوو. بریندارێکی کورد کە مەترسی ئەوە بکات دەگیرێت، خۆی خۆی دەکوژێت ئەگەر هێزی تێدا مابێت. هەتا ئێستا نەمان بیستووە کە سوپای عێراقی یەک گیراوی کوردی بەردابێت. بەڵام کورد هەوڵدەدەن یارمەتی سەرەتایی ئەسیرە عێراقیەکان بدەن لەگەڵ ئەوەی کە توانایەکی سنوورداریان هەیە، هەتا تەسلیمی سوپای عێراقیان دەکەنەوە. مرۆڤ ناتوانێت بەخەیاڵیشیا بێت کە پێشمەرگەیەکی ئەسیرکراو بگوێزرێتەوە بۆ خەستەخانەیەکی تێرۆرتەسەلی عێراقی، بەڵکو تەسلیمی سوپای عێراقی دەکرێت و بەشێوەیەکی گشتی تیرباران دەکرێن».

دوکتۆر بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «ئێمە لە کاتی هێرشە گەورەکەی بەهاری ساڵی ١٩٦٦ دا، ڕۆژانە سەدان بریندارى سوکمان وەردەگرت. ژمارەیەکی زۆر بەناپاڵم و چەکی تر دووچاری سووتاندن دەبوون. ئێستا بەشێکی زۆری ئەو سووتاوانە دووچاری ئیلتیهابات هاتوون کە زۆر زەحمەتە بتوانین چارەسەریان بکەین بەو برە کەمە ئیمکانیاتەی کە هەمانە». لە دوکتۆرم پرسی ئایا تۆ چۆن بریندارە سەخت و سووکەکان دابەش دەکەیت. ئەویش لە وەڵامدا وتی: لە ڕاستیدا بەگوێرەی ئەوەی کە

بریندارەکان چ پارچەیەکی لەشیان لەدەست داوە. بۆ نموونە بریندارێک کە دەست یان قاچ یانیش بینایی لەدەست دابێت دەکەوێتە خانەی بریندارە سەختەکانەوە. ئەوەشی بۆ نموونە پەنجە یانیش شوێنێکی لەشی بریندار بووبێت بەسووک لەقەڵەم دەدرێت. ئەو بریندارانەی کە لەشیان بەشێوەی جۆراوجۆر پێکراوە و خوێنیان کەم لەبەر ڕۆیشتبێت، لە خانەی برینداری سووکدا جێگا دەگرن.

ژمارەیەکی زۆرم لەو کەسانە بینی کە بەهۆی شەڕەوە کەم ئەندام بوو بوون، لە کەپرەکانی کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی کە لەگەڵ سەرکردەکانیاندا لە گفتوگۆی دووروودرێژدا بوون. گفتوگۆکان بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر دوو شت بوون: چارەسەری بریندارەکان و هاوکاری بۆ کەسوکارەکانیان تا برسی نەبن.

کەم ئەندامەکان و ئەوانەی کە پێویستیان بەیارمەتی هەبوو بەشێوەیەکی ڕەسمی دەنێردران بۆ کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی، بەڵام ئەوان پێیان چاکتر بوو کە بچنە لای بارەگای بارزانی. من بۆ خۆم ژمارەیەکی زۆرم لە وانە بینی لە نزیک خێمەکەی ژەنەراڵ بارزانییەوە هەروەک لە سەرەتای ئەم ڕاپۆرتەوە نیشارەتم پێکرد.

لە نێو ئەو کوردانەی کە داوای هاوکاریان دەکرد گەنجێکی کورد بوو کە باش نەیدەبیست و دەیویست جیهازێکی بەهێزکردنی بیستنی چنگ بکەوێت. ئەو زۆر کەللە ڕەقانە لە نزیک خێمەکەی بارزانییەوە لێی دادەنیشت و لەلایەن یاریدەری بارزانییەوە ڕۆژانە پارەی پێدەدرا، کە لە لاپەرەی بچوک بچوکدا لای خۆی تۆماری دەکرد و لە گیرفانی دا قایمی دەکرد.

دوو پێشمەرگەی ترم بینی کە یەکێکیان چاوی ڕاست و ئەوی تریان چاوی چەپی لە شەڕەکەی هەندرێندا لە دەست دابوو. ئەوان لە بارزانی، عەمەلیاتکردن و چاوی دەستکردیان دەویست.

بێجگە لە یاریدەری بارزانی، دوو کوڕی خۆشی لەوێ کاریان دەکرد، ئەوانیش ئیدریس و مسعود بارزانی بوون، کە هەمیشە بەدەم ئەو کەسانەوە دەهاتن کە داوای یارمەتییان دەکرد.

ئەوەم بۆ ڕوون نەبوودوە کە ئاخۆ ئەو دوو پێشمەرگەیەی کە چاویان لە دەست دابوو چییان بۆ کرا، بەلام من ئەوەم بیست کە ئەنجومەنی ڕاوێژی شۆڕش توانیبوویان لە گوندی گەلالە نەخۆشخانەیەکی ددان بکەنەوە و دوکتۆرێک لەوێ کاری دەکرد.

کوڕەکانی بارزانی کاروباری خزمەتی کۆمەلایەتی و دەرمان و کاروباری پزیشکییان دابین دەکرد. ئەوان جگە لەو ئەرکانەی لەسەر شانیان بوو، بەڕادەیەکی گەورەش نیوەی کارەکانی ئەنجومەنی شۆڕشیان لەسەر شان بوو.

هەندێک لە بریندارەکان شایەتی ئەوە بوون کە ڕژێمی عێراق لە شەڕدا چ جۆرە میتۆدێک بەکار دەهێنێت بەرانبەر کورد. لە ناو بریندارەکاندا پیاوێکم بینی کە قاچێکی پەڕیبوو، گەنجێکی بیست سالیم بینی کە بەسەختی دەست و سەری بریندار بوو بوو.

زۆربەی ئەو بریندارانەی کە هاوکاریان دەویست، گەلێک میتۆدیان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی داخوازیەکانیان یانیش نیوەی داخوازیەکانیان جێبەجێ بکرایە. زۆربەی جار کارەکە بەوە کۆتایی دەهات کە یەکێک لە کوڕەکانی بارزانی نامەیەکیان دەدا بەو کەسەی کە داوای یارمەتی دەکرد و دەیاننارد بۆئەو خەستەخانەیەی کە بۆ ددان دروستیان کردبوو لە گەلالە، یانیش دەیاننارد بۆ لای بەرپرسی دارایی لە کۆمیتەی ڕاپەڕاندن.

ئا بەو شێوەیە کاروباری کۆمەلایەتی و دەرمانی بەڕێوە دەچوون لە کوردستاندا. من لە دوکتۆر حەسەنم پرسی کە ئاخۆ چ نەخۆشیەک لەو ناوچەیەدا بەربلاوە. ئەو بەڕێز هەموویانی ناوزەد کرد: مەلاریا، تیفوس، زەحیری، ئیلتیهاب کردنی چاو و تراخوما، کەمبوونی ڤیتامین و ئێسکە

نەرمە هەروەها کەم خۆراکی و نەبوونی خوێن، بەشێوەیەکی گشتی لاوازی و کرمی مەعیدە و هتد.

نەوەد دەرسەد لەو نەخۆشانەی سەردانی دوکتۆر حەسەن دەکەن، تەمەنیان لەژێر چل سالییەوەیە، دەبوو کە تەمەنێکی درێژیان لە پێش خۆیان بەجێ هێشتبێت. زۆربەی ئەوانە بەدەست کەمبوونییەوە یانیش ئیلتیهاباتەوە دەناڵێنن، کە دەتوانرێت لەم سەردەمەی ئێمەی تێدا دەژین، بەشێوەیەکی ئاسان چارەسەریان بکرێت. بەڵام دوکتۆر بەم شێوەیە باسی گیروگرفتەکان دەکات: دەرمانەکانمان ناتوانن هیچ کەڵکیان هەبێت هەتا ئەوکاتەی کەمی پێداویستییەکانی ژیان هەبێت. برسێتی و ئەو نەخۆشیانەی کە لەوەوە بڵاودەبنەوە تەنها بەخۆراکی تەواو دەتوانرێت بەدژیان بوەستینەوە. پاشان دەکرێت کەڵک لە دەرمان وەربگیرێت. نموونەی بەرچاومان هەیە بۆ ئەوەی کە خۆراک و دەرمان چ دەورێکیان هەیە.

وڵاتی سوێد نموونەیەکی گەشاوەیە کە تێیدا ڕەفاهیەتی ژیان و خۆراکی باش بۆ هاوڵاتیان چاکترین هۆ بوون بۆ لە ڕەگ و ڕیشە هەڵکێشانی نەخۆشی سیل. زۆر وڵاتی تریش هەن کە ئەم ئەزموونەیان هەیە.

کوردستان دەتوانێت لە کاتێکدا کە لە ڕەوشێکی ئاساییدا بێت، خۆراک و پێداویستیەکانی ژیان پێشکەش بەهاووڵاتیانی بکات. ئەوە ئەو شەڕە پێنج سالییە و گەمارۆی نابوورییە کە خەڵکەکەی دووچاری برسێتی و کەمبوون کردووە.

هێرشە هەواییەکانی ڕژێمی بەغدا کە بۆ لەناوبردنی دەغڵ و دان و کوشتنی گیانلەبەران دەکران، وایکردووە کە خەڵکانێکی زۆر نەتوانن بەروبوومی کشتوکاڵییان بەکار بهێنن. لە سێبەری ڕەشی شەڕدا، ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی کەم خۆراکییەوە دەتەننەوە وەکو نەخۆشی سیل، لە ناوچەکەدا تەرەتێنیان بێت.

من ناتوانم ئەو نەخۆشیانە لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشم کە دووچاری

ئەخۆشە برسییەکان هاتوون. ئەوان لە سەرەتادا دەبێت خۆیان تێر بکەن. پرسیارەکە ئەوەیە بەچ شێوەیەک؟ لە کوێ هاوکاری پەیدا بکەین بۆئەوەی لەو برسێتییە کەم بکەینەوە؟ شتێکی مەحاڵە کە بتوانین لەلایەن دەوڵەتێکی عەرەبییەوە کۆمەکمان پێ بکرێت. ئەوان نایانەوێت خۆیان تووشی چەرمەسەری بکەن لەگەڵ هاونەژادانیان لە بەغدا کە کاروباری حکوومەت بەرێوە دەبەن.

خاچی سووری نێودەوڵەتی چەندین هەوڵیان داوە بۆ ئەوەی بەغدا ڕازی بکەن تا بتوانن خۆراک و دەرمان و جلوبەرگ بۆ کورد بنێرن، بەڵام بەغدا هەموو ئەو هەوڵانەی ڕەت کردۆتەوە.

ئابلۆقەی تەواوەتی لەسەر کوردستان وایکردووە کە وڵاتەکە بەتەواوەتی گۆشەگیر ببێت. لەسەر ئەم ڕەوشە دەزگا گەورەکانی دەنگوباس خۆیان کەڕ کردووە. بەرژەوەندی ئابووری وەهی تر وایان کردووە کە دەوڵەتی بەغدا بتوانێت ڕاگەیاندنی جیهانی و ڕاگەیاندنەکانی تر چاو بنووقێنن لە تراژیدیای کوردستان. زۆر کەم هەن کە بزانن چی لە شاخەکانی کوردستاندا ڕوودەدات.

بەڵام ئەوەی کە ڕوودەدات "کێشەیەکی ناوخۆی عێراق" نییە. بەڵکو کێشەیەکە هەموو مرۆڤایەتی پەیوەندیدار دەکات. بەهۆی پێکدادانەکانەوە هەموو خەڵکی کوردستان بەبەردەوامی ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە ، مردن لە ڕێگای برسێتییەوە، بەهۆی ئەو نەخۆشییانەی کە ناتوانرێت چارەسەریان بکرێت بەهۆی نەبوونی پێداویستی ژیان. لە هەموو شەڕ و کێشەکاندا، لایەنەکان هاوڕێ و هاوکاریان دەکرێت. عەرەبەکان هاوڕێیان زۆرە و، کوردیش کەم.

ئەم قسانەی دوکتۆرحەسەن لە کاتێکدا دەکرێن کە لەگەڵ ڕەوش و گۆڕانکاریەکاندا دەگونجێت، کاتێک دامودەزگای تورکەکان لە گەلێک لاوە هاوکاریان بۆ دێت، لە هەموو دنیاوە، کە زۆر دوورنین لەو گۆشەگیریەی کە

کورد دووچاری هاتوون، له کاتێکدا که بەشێوەیەکی بەربڵاو هاوکاریەکان دەنێردرێن بۆ تورکیا تا له کاریگەری ئەو کارەساتە سروشتییە کەم بکەنەوە که دووچاری ڕۆژئاوای تورکیا هاتبوو. بەڵام هیچ کام لەو ڕێکخراوانەی که لەو نزیکانەی ئێمە کاردەکەن نەیانتوانی دەستی یارمەتییان بۆ ئەو ناوچە سنووریانە ڕابکێشن که ئەوە بۆ پێنج ساڵ دەچێت له ناو کارەساتدا دەژین. ئەم کارەساتە بووەتە فاکتەرێک له ماوەیەکی درێژتر له شەڕی یەکەم و دووەمی جیهان.

ئەو ڕەوشە ئاڵۆزەی که خەڵکی سڤیلی کوردی تێدا دەژی، وەکو تاقیکردنەوەیەک وایە بۆ ڕێکخراوە مرۆڤایەتییەکان. ئایا ئەو ڕێکخراوە مرۆڤیانە چۆن بتوانن خۆیان بگەیەننە ئەو خەڵکانەی که پێویستیان بەکۆمەک هەیە لەو ناوچە کەنارگیرانە؟

من پرسیاری ئەوەم کرد که ئاخۆ چ دەرمانێک لەوانی تر زیاتر پێویستە، دوکتۆر ئاوا وەڵامی دامەوە:

- دەرمان دژی مەلاریا.
- دەرمان دژی جۆرەها کرم.
- پەنسلین و ستریتتۆمیسین و... هتد
- ماددەی میکرۆب پاککەرەوە.
- (د. د. ت) و سابون و جۆرەکانی.
- ماددەی ئارامکردنەوە.
- دەرمانی دژی ژەحیری و دژە بەکتریا، ئەو شلەیەی که دەکرێتە لەشەوە وەکو ئاوی موقەتەر، که بەهۆی ژەحیریەوە له لەشدا کەم دەبێتەوە.

هەروەها دوکتۆر ئارەزووی ئەوەی دەکرد که کەرەستەی برینپێچی و جەراحی و بابەتەکانی هەبێت.

دوکتۆر باسی ئەوەشی دەکرد که پێویستی زۆریان بەعەمبارێکی

پاراستنی دەرمان بەتایبەتی ئەو شلەیەیە کە لە جیاتی خوێن دەکرێتە نەخۆشەوە، هەیە، لەکاتی بۆردومانکردنە لە ناکاوەکانی عێراقدا.

لەپاڵ ئەو دەرمان و کەرەستانەی کە لەلایەن خاچی سوورەوە نێردرابوون، دەرمانیش دەبینرا کە نیشانەی ئێرانی و عێراقیان پێوە بوو، بەقاچاخی هێنرابوون.

من دڵم بەوە خۆش بوو کە توانیم ئەو ئامێرەی کە زەختی خوێنی خۆمم پێدەگرت لەگەڵ ئەو ئامێرەی کە دوکتۆر بۆ گوێگرتن لە دڵی نەخۆش دەیکاتە گوێچکەی، بەجێبهێڵم بۆ خەستەخانەی هاوپیشەکەم دوکتۆر حەسەن. سوپاسم کرد بۆ ئەو زانیاریانەی کە پێیدام و خاترخوازیم لێ کرد.

پرسیاری سەرەکی ئەوە بوو چۆن بتوانرێت خەستەخانەیەک کە بەمانای وشە خەستەخانە بێت بۆ ئەو دوکتۆرە عەرەبە کە خۆی کردبووە قوربانی و شایەنی بێت، دابین بکرێت. تەنها نەخۆشەکانی ئەو پێویستیان بەخەستەخانەیەکی وا نییە، بەڵکو هەموو دانیشتووانی ناوچەکە کە ئازاریان دەچێشت پێویستیان پێیە.

## دوا ڕۆژی ناوبردانم

ڕۆژی پێنج شەممە، ڕێکەوتی ۲٥ی ئابی ۱۹٦٦، دوا ڕۆژی میوانداریم بوو لەلایەن کۆمیتەی ڕاپەڕاندنی شۆڕشەوە. لە ڕاستیدا هەموو ناوچەکانی حاجی ئۆمەران - ڕەواندزم بینیبوو. ئەو ناوچەیە چەندین دۆڵ و شیوی لێیە، کە سەرەوخوار کوردستانیان لە خاچ داوە. ئەگەر مرۆڤ بیتوانیایە جادە قیرتاوەکانی دۆڵ وشیوەکان بەکاربهێنێ ئەوا دەتوانێت بەماوەیەکی کەم بەنێو کوردستاندا بگەڕێت. هەموو ئەو ڕێگانە دەچنەوە سەر ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەستی ڕژێمی عێراقدان.

ئەمدەویست ماوەیەکی زیاتر لە کوردستان بمێنمەوە ئەویش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان ئەوە بوو، هەستم دەکرد پێویستییەکانی خەڵکی سڤیلی کورد وایان دەخواست کە ڕاپۆرتێکی بەپەلە بنووسم بۆ کۆمیتەی سوێدی - کوردی، لەدوایشدا بۆ خەڵکی سوێد. دووەم ئەمدەویست خانەخوێکەم زیاتر زەحمەت بدەم بەهۆی جێگاگۆڕکێ و گواستنەوەم لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ.

دەنا هەتا بڵێی لەگەڵ هاوڕێکانمدا خۆشم ڕادەبوارد. کۆمیتەی ڕاپەڕاندن منیان بەباشترین خواردن کە دەست بکەوتایە، دەعوەت دەکرد، بەڵام من ئیشتیای خواردنم نەمابوو لە کوردستان. بۆ هەرشوێنێک دەڕۆیشتم هەژار و بەلەنگاز و، مرۆڤی برسیم دەدیت بەخۆیان و دەموچاوە لاواز و چاوە زەرد هەڵگەڕاوەکانیانەوە. ئەوان کاتێک دەیانزانی کە من دوکتۆرێکی سوێدیم دەهاتنە پێشەوە لێم و باسی نەخۆشیەکانی خۆیانیان بۆ دەکردم، کە زۆربەی ئەو نەخۆشیانە بەهۆی کەمبوونی ماددەی پێویست و نەبوونی دەرمان بەدژی مەلاریا و... هتد، بڵاوبووبوونەوە.

## بەرەو بارەگای بارزانی

ڕۆژی هەینی ٢٦ی ئاب، ناوپردانم بەجێ هێشت و لەگەڵ مەحەمەد مەحموود (سامی) کە کوڕێکی گەنجی ئەندامی کۆمیتەی ڕاپەڕاندن بوو، بەرەو بارەگای بارزانی ڕۆیشتین. سامی پێنج ساڵ لە زانکۆی لەندەن ژیانی بەسەر بردبوو، هەر بۆیە بەئینگلیزی قسەمان دەکرد. ئەو چەندین ساڵ بوو ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەم شتانەی بۆ باس کردم: «ساڵی ١٩٦١، عەبدولکەریم قاسم توانیبووی بەرەوڕووی پارتی کوردان ببێتەوە، زۆر لە ئەندامانی پارتی زیندانی کردبوو، بەشێک لە بارەگاکانی حزب ویران کرابوون، کاتێک ژەنەراڵ بارزانی دەستی بەبەرگریکردن کرد لە ناوچەکانی بارزان لە ١١ ئەیلولی ١٩٦١ دا. لەو ڕۆژەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان دەستی بەخۆڕێکخستن کردەوە لە دەوری بارزانی. لە نێوان بارزانی و ئەندامانی پارتیدا ناکۆکی سەری هەڵدابوو. سکرتێری پارتی ئیبراهیم ئەحمەد و پاشانیش جەلال تاڵەبانی کە کەسێکی گرنگ بوو، بارزانییان بەجێ هێشت. جەلال تاڵەبانی لە هەولی ئەوەدابوو کە لەلای خۆیەوە لەگەڵ ڕژێمی عێراق ڕێک بکەوێت. وێنەکانی لە هەموو لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی بەغدا دا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی پێشوو عەبدولڕەحمان بەزازدا بلاودەکرایەوە. بەربەرەکانی جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد لە دژی بارزانی، بووە هۆی پیشاندانی هێزی بارزانی. پێشمەرگەکانی ژێر دەستی جەلال تاڵەبانی بەشێکی زۆر کەم و هیچ لەبارانەبووی لەشکری کورد پێک دەهێنن، کە نایانەوێت بەدژی ژەنەراڵ بارزانی چەک هەڵبگرن. دوای ئەو لێک ترازانە، ڕژێمی عێراق وای دەزانی کە ئێمە ناچار دەکات هەرچۆنێک بێت لەگەڵیان ڕێک بکەوین. بەڵام هەرزوو بۆیان دەرکەوت کە هاوکاریکردنی تاڵەبانی لەگەڵ عێراق ناتوانێت تەرازووی هێز بەلای خۆیاندا بشکێنێتەوە. ئێمە لەو باوەڕەداین کە تاڵەبانی زۆر کەمتر ڕێزی لێ دەگیرێت لە بەراورد لەگەڵ ئەو کاتەی کە شان بەشانی بارزانی وەستابوو».

## دیدار لەگەڵ میوانانی تازە

دەم ژمێر چوار گەیشتینە بارەگای بارزانی. من بەدوای ئەو هاوڕێیانەدا گەڕام کە جاری یەکەم لێرە بینیبوونم. بەڵام پێیان وتم کە ئەوان لێرە نەماون و میوانی نوێ لە شوێنەکانی ئەواندان. سیاسەتی بارزانی ئەوە بوو کە خەڵک لە هەموو کوردستانەوە بانگهێشتن بکات و لەگەڵیان گفتوگۆ بکات لە شوێنە جیاوازەکانی خۆیدا، ئەو ماوەیەی کە دەمێننەوە وەکو میوانی شەخسی خۆی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات. دوو کەسم بینی کە برای یەکتربوون، ئەوانیش سەلاح و مستەفا نێروەیی بوون، لە هەمان کاتدا سەرۆک عەشیرەت و بەرپرس بوون لە پێشمەرگەکانی باکور.

سەرداری حەمەد ئاغا کە ئەجونتانی بارزانی بوو پێی ڕاگەیاندین کە بارزانی دەتوانێت ئێوارەی شەممەی ٢٧ی ئاب پێشوازی لە میوانان بکات. پاشان ئاگادری کردین کە بارزانی تووشی ددان ئێشەیەکی سەخت بووە، بۆیە نەیتوانیووە میوانەکانی ببینێ. ئێمە چاوەڕێمان کرد تا ڕۆژی دوایی، ئەو شەوە لە جێگا کۆنەکەی خۆم خەوتم لەگەڵ میوانانی تازە کە لەسەر زەویەکە جێگایان ڕاخستبوو.

ڕۆژی دوایی ئاگادار کراین کە بارزانی دەوری سەعات ١٠ی پێش نیوەڕۆ، پەیدا دەبێت. وەک هەمیشە یەکێک لە خێمەکان ئامادەکرا. دەوروبەری ١١ بوو کە بینیم هەموو ئیگاکان بۆ لای ئەو دەربەندە دەیانڕوانی کە کەوتبوە خوار ئێمەوە، کاروانێکی بچووک کە لە پێنج شەش ئێسترێک پێکهاتبوو بەهێواشی لێمان نزیک دەبوونەوە. لە ئەسپی یەکەمیان کەسێکی جل سپی سواربوو بوو کە دەموچاوێکی مەسیحییانە و ریشێکی سپی هەبوو، ئەویش شێخ نازم ئەلعاسی بوو کە بەرپرسی سیاسی و ڕۆحی عەشیرەتی ئەلعوبێد بوو، لە بەدەویەکانی ناوچەی کەرکوک بوو. دوای ئەوەی کە میوانەکان گەیشتنە ناو خێمەکە، بارزانی خۆیشی پەیدا بوو. دەوری سەعات ١٢ شێخ دەستی کرد بەنوێژکردن لەگەڵ

ئەو چەند کەسەی کە لەدوایەوە بوون. پاش تەواو بوونی نوێژەکەی، لەسەر زەویەکە دانیشت و بەدەنگێکی بەرز دەستی کرد بەپاڕانەوە و دوعاکردن بۆ برایەتی کورد و عەرەب.

## خاتر خواستن له بارزانی

بارزانی کاتێک منی بینی که لەبەردەم خێمەکەدا دانیشتبووم، ئیشارەی بۆکردم و پێی وتم که بڕۆم بۆ لای. چەند هەنگاوێک وەستا ، بەبێدەنگی چاوی لێ دەکردم. ناچاربووم که بێدەنگییەکە بشکێنم، بەناوی کۆمیتەی سوێدی - کوردییەوە سوپاسم کرد بۆ ئەو میوانداریەی کە ئەو دە ڕۆژە لێیان کردم. من بەژەنەراڵ بارزانیم وت: لەکاتی گەڕانەوەمدا چەند ڕۆژێک لە جنێڤ دەمێنمەوە، پێم وت کە ئاخۆ هیچ داخوازی و ڕاسپاردەیەکی هەیە کە بیگەیەنم بەکۆمیتەی خاچی سووری نێودەوڵەتی، چونکە من دەمویست ڕاپۆرتێکیان لەسەر ڕەوشی کوردستان پێشکەش بکەم. دەبێت ئەوەش بڵێم کە من هیچ کارەکتەرێکی فەرمیم لەم کارەدا نییە. بارزانی لە وەڵامدا وتی: «تۆ بۆ خۆت بەچاوی خۆت ڕەوشەکەت بینیوە. من نامەوێت لە ڕاپۆرتەکەی تۆ خۆم هەڵقورتێنم، کە بۆ خۆت بەرنامەت بۆ داناوە. تۆ دەتوانیت لە ڕاپۆرتەکەتدا بۆ ڕێکخراوەکەت و خاچی سوور، ئەوەی کە خۆت پێت مەنتقییە بینووسی، بۆ خۆت بینیوتە خەڵکی سڤیلی کورد لە چ ڕەوشێکدا دەژی» پێش ئەوەی خواحافیزی لێ بکەم ، جارێکی تر سوپاسی هەندێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ڕاپەڕاندم کرد، بۆ ئەو ڕاپۆرتەی کە بەکورتی لەسەر ئەو پاکتاوکردن و ئەشکەنجەیەی کە لە کوردستاندا بەڕێوە دەبرێت لەلایەن عێراقەوە ئامادەیان کردبوو بۆم.

## پیلوی راستی و عەدالەت

دوای ئەوە، بۆ نانی نیــوەڕۆ لەهەمــان چادردا کــە شــێخ نازم و ئەو چوارکــەسـەی کـە لەگـەڵی بوون، ئامـادە بووم. شـێخ وەکـو یەکـێک لە گرنگترین سـەرۆکە ئایینییەکانی عێراق باسی لێ وەدەکرا، کە کاریگەری زۆری بۆ کورد هەبوو. ئەوەی کە بەو شێـوەیە و وا بەڕێزەوە پێشـوازی لێ دەکرا، چونکە ڕێگای نەدابوو ئەندامانی خێڵەکەی لە تالانکردنی ماڵی کورداندا بەشداری بکەن. کاتێکیش قسـەم لەگەڵ کرد ، ئەو شتـەی لێ نەشاردمەوە.

شەڕی عێراق لەگەڵ کورددا بووبووە هۆی ئەوەی کە زۆر لە کوردەکان دوو دڵ بن لە بەرانبەر وتەکانی ئیسـلام لە مەڕ برایەتی دنیـایی. من پێشتـر لەگەڵ ئیدریس بارزانی لەمەڕ پەیوەندی کورد بە ئیسـلام، گفتوگۆم کردبوو. ئیدریس بارزانی لە وەڵامدا وتی: شەڕی عێراق و کورد وای کردووە کە بیروباوەڕی کورد بەرامبـەر هەندێ وانەکان لاواز ببێ. هیچ کاتێک پێش ئێستا بەم شێوەیە کورد دووچاری هەڕەشەی شەڕی پاکتاوکردن نەبوون لەلایەن لایەنگرانی ئیسلامەوە. ئیدریس دەیگوت کە هەڵەکە لە قورئانەوە نییــە وەکــو ڕێ نیـشــاندەرێک، بەڵکو هەڵەکـە لە دەسـەڵاتدارانی عێراقییەوەیە. سیاسەتی عێراقییەکان کاریگەری نازیزمی لەسەرەو، عەبای ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەخۆ ئاڵاندووە. ئێستا یەکێک لە سەرۆکە ئایینیــیەکـانی عـەرەب هاتبـوو بۆ لای بارزانی، تا لەبەردەم چاودێرانی بیـانیـدا دان بنێت بەو هەمـوو تاوانانەی کـە لەلایەن عـێـراقـەوە دەرهەق بەکورد کراون.

هیچ زانیـاریەکم، لەسـەر ناوەڕۆکی دانیشـتنەکەی شێخ نازم و بارزانی دەست نەکەوت کە ئاخۆ باسی چیان کردووە. ئەوەش ڕوون نەبوو کە ئاخۆ، شێخ وەکو کەسـێکی سـەربەخۆ هاتبوو یانیش لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە نێردرابوو.

ئەوەی گرنگ بوو بۆ ڕاپۆرتەکەی ئێمە ئەوە بوو کە سەرۆکێکی ڕۆحی بەئاشکرا باسی تالانکردن و دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی کوردانی دەکرد.

دەمویست بزانم ئاخۆ شێخ نازم ڕێگام دەدات وێنەیەکی بگرم. لەسەرەتادا ڕازی نەبوو، چونکە کارێکی وا بەدژی پرنسیپەکانی قورئانە. کامێراکەم هێنا و پێموت کە بەبێ بەکارهێنانی کامێرا ناتوانم ڕاپۆرتێک لەسەر ژیانی خەڵکی سڤیل بنووسم، ئیتر ئەوە بوو ئەویش ڕێگای دام وێنەیان بگرم.

ڕەنگە ئەو بۆیە ڕێگای دابم وێنەی بگرم، تا هاودەردی خۆی لەگەڵ کورد نیشان بدات و بەڵگەیەکم بداتێ کە ئەو لە هاتنەکەی سادقانەیە. کورد بەم شێوەیە لەسەر شێخ قسەیان دەکرد: «ئەو پیاوێکی عادلە و شێخێکی باشە، ، ئەو کاتەی کە سوپای عێراق ئێمەی دەرکرد لە گوند و ماڵ و موڵکەکانمان، شێخ ڕێگای نەدا خێڵەکەی لە تالانیکردنی ماڵی کورداندا بەشداری بکات.»

ڕۆژی شەممەی ٢٨ی ئاب، دوا ڕۆژی من بوو لە باشووری کوردستان. پێش ئەوەی سەفەر بکەمەوە بۆ لای خۆمان، لە ڕێگا لە جنێف لامدا، تا سەردانێکی کۆمیتەی خاچی سووری نێودەوڵەتی بکەم.

## کۆبوونەوەم لەگەڵ پ. گایلارد، کۆمیتەی خاچی سوور

پێنج شەممەی یەکی ئەیلول کە بەخەبەر هاتم لە میوانخانەی(هوتێل)ی پریزدینت لە جنێڤ، خۆم دییەوە. تەلەفۆنێکم بۆ هاوڕێیەکم کرد کە لەخەستەخانەی زانکۆی جنێڤ کاری دەکرد. بەڵام خۆش بەختانە ئەو ڕۆژە کاری نەدەکرد. هات بۆ هوتێلەکە بۆلام و بردمی بۆ بارەگای نێونەتەوەیی خاچی سوور.

ناوی خۆم نووسی لە پرسگەکەی گایلارد، دەمزانی ئەو پێشتر لەگەڵ کێشەی کورددا خەریک بووە. لەو کاتەی خەریکی ناونووسین بووم لەلای پاسەوانەکە و بۆم باس دەکرد کە چ نیشێکم هەیە، گایلارد لەوێوە ڕەتبوو. کابرای کارمەند یەکسەر منی پێناساند و، ئەویش وتی دەتوانیت ئێستا لەگەڵم بێیتە ژوورەوە. ژوورەکەی لەقاتی سێیەم بوو.

ئەو لە پلەی یەکەمدا دەیویست بزانێت ئەو هاوکاریانەی کە لەلایەن ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکانەوە ناردراوە بۆ کوردستان، چیان بەسەر هاتووە. پاشان وتی: «ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەست نەگەیشتووە کە ئاخۆ هاوکاریەکان گەیشتوونەتە کوردستان یان نا. ئێمە بەلامانەوە گرنگ نییە بەچ ڕێگایەک و بەچ شێوەیەک هاوکاریەکان گەیشتوونەتە کورد».

منیش لەوەڵامدا وتم کە یارمەتییەکان گەیشتوونەتە کوردستان لەو ماوە ناخۆشەی بەهاری ساڵی ١٩٦٦. هەڵبەت من نەمدەتوانی وەڵامی ئەوە بدەمەوە کە ئاخۆ یارمەتییەکان بەتەواوەتی گەیشتوونەتە کوردستان یان نا. پێم وت: کۆمیتەی ڕاپەڕاندن و بارزانی، سوپاسی ئێوە دەکەن بۆ هاوکاریەکانتان. ئەو لەگەڵ مندا لەسەرئەوەی کە پێم وابوو زۆر زەحمەتە بتوانرێت پەیوەندی بەکوردەوە بکرێت، کۆک بوو. پێی ڕاگەیاندم کە خاچی سوور لەهەوڵی ئەوەدان وەفدێک بنێرن بۆ کوردستان، بەڵام ئێستا دەنگۆی

ئەوە هەیە کە شەڕەکە تا ئەم کاتەدا وەستاوە و، باسی ئەوە دەکرێت کە کێشەکە بەئاشتی چارەسەر دەکرێت، بۆیە ئێمە تا کاتێکی تر هەوڵەکەمان وەستاندووە.

پێم وت کە کورد لەو ماوەیەی کە پێیدەوترێت گفتوگۆ بۆ ئاشتی، پێویستییەکی زۆریان بەدەرمان و جل و خۆراک هەیە. هیچ گەرانتیەک نییە بۆ ئەوەی کورد جارێکی تر یانیش چەندین جاری تریش هێرش نەکرێتەوە سەریان. ئێستا درەنگە کە خاچی سوور وەفد بنێرێت. بۆم باس کرد کە من بۆ خۆم دوو بەتانیم بەخۆمدا دەدا کە خاچی سوور ناردبوونی، هیچ کاتێک هێندەی ئەو کاتەی کە خۆم گرمۆڵە دەکرد لە ژێر ئەو بەتانیانەدا، بۆ ئەوەی خۆم لەسەرمای بەیانیانی شاخەکانی کوردستان پێش خۆر هەڵهاتن بپارێزم، لە گرنگی هاوکاری مرۆڤانە نەگەیشتووم.

من باسی کێش و گرنگی ئەوەم کرد کە وەفدێک بنێردرێت بۆ لێکۆڵینەوە لە کوردستان. شەڕی پێنج ساڵە و ئابلۆقەی دەرمان و خواردن و هتد و، بەخەستی بۆردومانکردنی کوردستان بەناپاڵم، دەکرێت بکرێتە هۆکارێک بۆ تێگەیشتن لەوەی کە لە کوردستاندا پێویستی بەهاوکاری هەیە.

بە ڕاستی جێگای داخە کە ڕێکخراوە مرۆڤیەکانی جیهان نەتوانن وەفدێک بنێرن بۆ کوردستان. کۆمیتەی خاچی سوور هەقی ئەوەی هەیە وەفدێک بنێرێت. بۆم باس کرد کە کۆمیتەی سوێدی - کوردی توانیویەتی کاریگەری لەسەر خاچی سووری سوێدی پەیدا بکات، ئەو بەباشی ئاگاداری ئەوە بوو. داوای لێ کردم کە ڕاپۆرتێکی نووسراو ئامادە بکەم بۆ خاچی سووری نێودەوڵەتی لەمەڕ باشووری کوردستان. پاش ئەوەی ڕەزامەندی کۆمیتەی کوردی - سوێدیم وەرگرت، ڕاپۆرتێکم بۆ ئامادەکردن و بۆم ناردن.

## نامەیەکی درەنگ کەوتوو

ڕۆژی شەممە ٣ی ئەیلوول گەیشتمەوە فرۆکەخانەی ئارلەندا (ستۆکهۆڵم)، بەخۆم و نۆسەد وێنەی ئەشۆردراوەوە و، کۆمەڵێک تێبینی کە لەسەر ڕۆژمێرێک نووسیبوونم. ڕۆژی دوایی سەیری سندوقی پۆستەکەم کرد نامەی شەش هەفتەی تێدا کەڵەکە بووبوو. لە ناو نامەکاندا ئەم نامەیەشم بۆ هاتبوو:

ئازیزم سەلاحەدین

هیوادارم دڵت لێم ئەرەنجێ کاتێک دەبیستی من لە هەوڵەکانمدا سەرکەوتوو نەبووم، بۆ ئەوەی بتوانم ڕێگایەکت بۆ پەیدا بکەم تا بچیتە کوردستان. ئەمتوانی پەیوەندی ببەستم بۆ ئەوەی کەسێک پەیدا بکەم کە لەگەڵ خۆی لە سنوور بتپەڕێنێتەوە بۆ کوردستان.

لەگەڵ جوانترین سڵاومدا

ن.ن

## پێشکەش بەهاوڕێکانم، قاچاخچییەکان

شانسم هەبوو کە پێش سەفەرکردنەکەم بۆ کوردستان، ئەو نامەیم بەدەست نەگەیشت، ئەو شوێنەی کە لە هەموو مرۆڤایەتی دایانبڕاندووە. توانیم سەفەرەکەم بکەم بەهۆی چاکەی ئەو قاچاخچییانەوە کە یارمەتی دەرن بۆ کەمکردنەوەی برسێتی لەو وڵاتەدا. من بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە دەمەوێت ئەم ڕاپۆرتە پێشکەش بەو هاوڕێ نەناسراوانەم، قاچاخچییەکان بکەم، کە بەهۆی ئەوانەوە ئێمە توانیمان پەیوەندیەکی بچکۆلە لەگەڵ ئەو ئەندامانەی مرۆڤایەتی کە لەبیرکراون، بگرین.

نامەوێت بەرپرسیارێتی ئەوە بخەمە سەرشانم کە باسی ژیانی خەڵکی کوردستان بکەم. کورد خۆیان دەتوانن ئەو کارە بکەن. بەڵام بەچ شێوەیەک؟ هەموو پەیوەندیەک لەگەڵ ئەوان قەدەغەیە. من تەنها هەوڵی ئەوەم داوە بتوانم ببم بەپردێکی بچکۆلە لە نێوان ئەوان و دنیادا. دەبێت ڕێگا بەکورد بدرێت خۆیان داخوازی و مافە مرۆڤایەتیەکانیان بخەنە پێش چاو. دەبێت مەجالی ئەوەیان بۆ بڕەخسێنرێت کە بتوانن باسی ئەو ئەشکەنجە و هەوڵدان بۆ پاکتاوکردنی نەژادییە بکەن، کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە. لە دوو بەشی داهاتووی ئەم ڕاپۆرتەدا، ئەوان خۆیان دێنە قسە و باسی ژیانی خۆیان دەکەن. گێڕانەوەکان هی ئەوانن. ئەوان خۆیان بەرپرسیارن لە دروستی گێڕانەوەکان بۆ کۆمیتەی سوێدی - کوردی. -

## لەمەر پاکتاوکردنی ئەژادی و ئەشکەنجە لە کوردستاندا

بەشی زانیاری کۆمیتەی ڕاپەڕاندن

لە ١١ ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ دا جارێکی تر ڕژێمی عێراق دەستی کردەوە بەشەڕ دژی گەلی کورد. لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ بۆ ماوەیەکی کورت شەڕەکە وەستێنرا، بەڵام هێزشەکان سەرلەنوێ لە ٩ ی تەمووزی ١٩٦٣ دا دەستیان پێکردەوە بەشێوەیەکی ماڵوێرانکەرانە. پاشان لە ١٠ی شوباتی ١٩٦٤ دیسان بۆ ماوەیەک شەڕەکە وەستێنرا، لە نیسانی ساڵی ١٩٦٥ دا دەستی پێکردەوە تا ناوەراستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ درێژەی کێشا. هەزاران لە خەڵکی بێ تاوان و ئاشتیخواز بوونە قوربانی شەڕەکان، ڕژێمی عێراقی تەنیا مەبەستی لێدانی هێزەکانی پێشمەرگە نەبوو بەڵکو خەڵکی سڤیلیشی گرتبووەوە، لەوانەش سەدان گوند و دەغڵ و دان و ئاژەڵیان لەناوبردران. لە ماوەی شەڕەکەدا ڕژێم گوندە کوردییە ئاشتیخوازەکانیشی بۆردومان دەکرد لەگەڵ شارەکانی کە لەژێر دەستی خۆشیاندا بوون لەوانەش: قەڵادزێ، ئامێدی، دهۆک، زاخۆ، ڕەواندز، پێنجوێن و کۆیە و زۆری تر. دانیشتووانی شارەکان ناچاردەکران ماڵ و حاڵی خۆیان بۆ خێڵە عەرەبەکان بەجێ بهێڵن، لە خانووی نوێدا جێگیر دەبوون کە لەسەر کەلاوەکانی گوندە کوردییەکان دروستیان دەکردن.

ئەم ڕاپۆرتە هەندێک لەو کارلکاریانە لەخۆدەگرێت، کە ژمارە و ڕۆژی تاوانەکە و ئەوەی کە بەسەر خەڵکی سڤیلدا هاتووە، بەتایبەتی ژن و منداڵ. ئێمە بەهیوای ئەوەین بتوانین بەووردی تاوان و پێشێلکاریەکانی ڕژێمی عێراقی کە پێچەوانەی نۆرمە نێونەتەوەییەکانن، بخەینە ڕوو.

تەنها ئەوە بەس نییە باسی کوشتاری کودەتاچییەکانی شوبات لە ژێر ڕابەرایەتی حزبی بەعـــدا بکەین کـە لەدوای ســاڵی ١٩٦٣ وە پێی هەستاون. ئەو تراژیدیانەی کە لەلایەن ڕژێمی قاسمەوە کران، هەڵدەگرین بۆ هەلێکی تر.

## کۆمەڵکوژی لە شاری سلێمانی*

ئەم کۆمەڵکوژییە لەلایەن پارتی بەعسەوە کرا، کە لە شوباتی ١٩٦٣دا دەوڵەتیان پێکەوەنا و بڕیاریان دا شەڕەکە هەڵگیرسێننەوە، بەو شێوەیە ئەو پەیمانانەی دابویان کە دەیانویت کێشەکە بەئاشتی چارەسەر بکەن، خستە ژێر پێ.

ئەم ڕووداوانە لە ئێوارەی ٨ و ٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ دا لە شاری سلێمانی ڕوویانداوە، کە گەورەترین شاری کوردە. ئەم میتۆدانە بەکارهێنران:

١- ڕاگەیاندنی ڕەوشی نائاسایی بەبێ ئەوەی پێشتر خەڵکەکە ئاگادار بکرێنەوە.

٢- گرتنی هەموو ڕێگاو بان و ناوەندی شار بەدەبابە و سەرباز کە بەچەکی مۆدێرن چەکدار کرابوون.

٣- پشکنینی هەموو ماڵەکان بۆ گەڕان بەدوای چەکداردا.

٤- نیشانەکردنی هەموو ئەو خانووانەی کە دەپشکێندران.

٥- سوکایەتی کردن و لێدانی ژنان و پیرەکان.

٦- گرتنی پێنج هەزار کەس بەکارمەندانی شارەوانی و پیاوانی باوەڕپێکراودوە، لەوانەش بەرپرسی کاروباری تەندروستی و بەرپرسی کارگەی چیمەنتۆ و جگەرە و هەموو دوکتۆر و ئەندازیار و پیاوانی ئایینی و هەموو کۆنە ئەفسەرەکان. ئەو پێنج هەزار کەسە دووچاری ئەشکەنجە کرانەوە و، لە سالۆنی سەربازیدا بەبێ ئاو و خواردن، هێشتنیانەوە. کەسوکاریان بۆیان نەبوو سەردانیان بکەن.

* لێرەوە نووسەر کۆمەڵێک ناوی هێناوە، ،واتە ناوی کەس و گوند و ناوچە، کە لەوانەیە هەندێکیان بەهەڵەیی نووسرابن. بەداخەوە وەرگێڕ هەوڵی نەداوە لێیان بکۆڵێتەوە یان ڕاستیان بکاتەوە. ئێمەش وەک دەزگا دەرفەتی ئەم کارەمان نەبووە، هەرچەندە لە زۆر شوێنیش ڕاستمان کردوونەتەوە- ئاراس.

٧- زۆربەی ماڵ و دوکان و گۆڕەپانەکان لەلایەن سەربازە بێ بەزەییەکانەوە تالان کران.
٨- دەستدرێژی کردنە سەر ژنان و کچانی گەنج.
٩- لێدانی پیاوە پیرەکان لەلایەن هەندێک لە سەربازەکانەوە. شایەتێک دەگێڕێتەوە کە «سەربازەکان ماڵی پیاوێکی زۆر پیریان پشکنی بەناوی حاجی سیامەند بۆ ئەوەی تالانی بکەن. بەڵام ئەوان هیچیان دەست نەکەوت تا بیدزن جگە لە سێ پاکەت جگەرە، بۆیە ئەوان سوکایەتییەکی زۆریان پێکرد، لە پای ئەوەی هیچی لەماڵەکەیدا نەبوو تا بیدزن».
- لە نزیک سەیوانەوە وەستا مەحموود و فرۆشیار عەلی باوەیان کوشت.
- کارمەندی شارەوانی عومەر ئەمینیان لە سەرشەقام کوشت.
- کوتاڵفرۆشێکیان لەگەڵ براکەی بەناوی مەحموود حاجی عەبدولڕەحمان لە خانووەکەی خۆیاندا کوشت.
- میوەفرۆش، عەلی جولیان لە شەقامی سەیوان گوللەباران کرد.
- سەربازانی عێراقی هێرشیان کردە سەر جێگا وەرزشیەکان، محەتەکان و ئەندامانی تیپی فوتابالی. ژمارەیەک مامۆستایان کوشت، لەناویاندا یاسین محەممەد ساڵح و ئیسماعیل ئیبراهیم و محەممەدی حاجی ساڵح و ئەنوەر سەعید و دڵشاد حەمە فەرەج و سەردار بێکەس، هەبوون.
- هەشتا زیندانییان بەبێ مەحکەمە لە سێدارەدا، لەناویاندا:
کەمال محەممەد حاجی فەرەج کە خاوەنی کۆمپانیایەکی بارهەڵگرتن بوو.
نووری وەیس، کارمەندی دەوڵەت بوو، دوای ئەوەی کە ئەشکەنجە دەدرێت، دەیکوژن، لە کاتێکدا هیچ پەیوەندیەکی بەپێشمەرگەوە نەبوو بوو. قوتابیانی لاو کرابوون بەژێر دەبابەکانەوە بە بەهانەی ئەوەی کە لە شانەی شۆڕشدا ئەندامبوون، لە ناویاندا دارا عەبدولقادر، کە قوتابی بوو لە زانکۆیەکی ئەورووپی، حەمە سدیق و حەسەن سەردار کە قوتابیی خوێندنی بالا بوون و زۆری تریش.

- له سه‌یدسادق که له‌نزیک شاری سلێمانییه، ئه‌فسه‌رێکی سوپا به‌ناوی مه‌ته‌ر عه‌ماش، ١٦ که‌سی گولله‌باران کرد که له نێویاندا ژن و منداڵیش هه‌بوو، پاشان فه‌رمانی دا هه‌موو ناوچه‌که بسووتێنن.

ئه‌فسه‌رێک که نه‌یویستبوو فه‌رمانی عه‌ماش جێبه‌جێ بکات، له‌لایه‌ن عه‌ماشه‌وه ده‌کوژرێت. پاشان وایان ڕاگه‌یاند که ئه‌و ئه‌فسه‌ره، خۆی خۆی کوشتووه.

- له خانوویه‌کی نزیک سینه‌ما ڕه‌شید له سلێمانی پیاوێکیان به‌ستبووه‌وه و پاشان ١٢ سه‌رباز به‌فه‌رمانی ئه‌فسه‌رێک ده‌ستدرێژی ده‌که‌نه سه‌ر ژنه‌که‌ی.

دوای ئه‌وه‌ش ته‌رمی (٢٦٧) که‌س له ناو شار و ده‌وروبه‌ریدا دۆزرانه‌وه. کێ بوون ئه‌وانه‌ی که ڕاسته‌وخۆ به‌رپرسیاری کوشتنی ئه‌و خه‌ڵکه سڤیله بوون؟ ئاشکرا بوو که برای سه‌رۆک کۆماری ئێستا (عه‌بدولڕه‌حمان)، سه‌رۆک کۆماری پێشوو عه‌بدولسه‌لام عارف و پارتی به‌عس بوون که به‌رنامه‌یان هه‌بوو له ڕێگای هه‌وایی و پیاده‌شه‌وه شاره‌که خاپوور بکه‌ن.

به‌ڵام هه‌ندێک له ئه‌ندامانی ده‌وڵه‌ت دژی ئه‌و پیلانه بوون. ده‌ره‌جه‌دارانی سه‌ربازی به‌رنامه‌که‌یان خسته ئه‌ستۆی خۆیان و پیاده‌یان کرد و به‌رپرسیارێتی ئه‌و کوشتاره‌یان که‌وته سه‌ر شان، ئه‌وانیش ئه‌مانه بوون:

١- جه‌نه‌راڵ سدیق مسته‌فا.

٢- سه‌رۆکی پۆلیس حه‌سه‌ن زه‌ینه‌لعابدین.

٣- زابت جاسم.

٤- دوکتۆری سوپا محه‌مه‌د عه‌لی حوسێن، که ئه‌ندامی حزبی به‌عس بوو.

٥- کاپتن عابد عه‌لوان، به‌رپرسی لقی دیسپلینی سوپا.

هه‌زاران پیاو و ژن ده‌توانن به‌وردی شایه‌تی له‌سه‌ر ئه‌م کۆمه‌ڵکوژیه بده‌ن. شاری سلێمانی جارێکی تریش ڕووبه‌ڕووی هێرشێکی له‌و جۆره بووه‌وه، دواهه‌مینیان له ٢٣-٢٤ ئاداری ١٩٦٦.

## کۆمەڵکوژی لە شاری کۆیە

شاری کۆیەش ئەو دیمەنە ئازاراویانەی لەوەی سلێمانی بەخۆیەوە بینی، لە تەمموزی ١٩٦٣ دا کە ئێمە توانیومانە ئاگاداری لەسەر بەدەست بخەین، ئەم تاوانانە ڕوویانداوە:

- دووکەس بەناوی شەفیق حەمەخان و کەمال ڕەشید حەویزی بەدوو عەمودی تەلەفۆنەوە هەڵواسران.

- ژن و کچانی گەنج دووچاری دەست درێژیکردن بوونەوە.

- سێ شوانی مێردمنداڵ گوللەباران کران لە کاتێکدا خەریکی نان خواردن بوون. ئەم گوندانەی دەوروبەری شارەکە بۆردومان کران:

١- کونە گورگ.

٢- تۆپقاوا.

٣- شلێ.

٤- داربەroولە.

٥- شیواشۆک.

٦- مام قەلیش. هەموو شتە بەقیمەتەکانی ئەم گوندانە بەتاڵان بردران، ژنانی بێچارە کوژران لەکاتی بۆردومانەکەدا.

٧- گوندی یارمە لەلایەن ٨٠ کەسی بەعسییەوە هێرشی کرایە سەر. دوو کەس لەو گوندەدا کە ئامادە نەبوون خۆیان تەسلیم بکەن، کوژران، لە نەتیجەدا هەموو گوندەکەیان سووتاند.

٨- گوندی بابەزۆک سووتێنرا. کەسێک بەناوی عەلی حەمە وەیسی بریندار بوو و ژنەکەشی کوژرا.

٩- گوندەکانی تیمەرۆب، شۆزێر و شاوەشکۆ سووتێنران.

١٠- گوندی سەویرلی بۆردومان کرا کە تیایدا کوێخای گوندەکە، کوێخا ڕەسووڵ کوژرا.

١١- لە گوندی قازبەگی حەوت کەس بریندار کران. چواریان، دوو ژن و

دوو منداڵ گیانیان لەدەستدا.

١٢- لە لۆگید شازدە کەس کوژران و چوار کەسیش بریندار بوون.

١٣- لە گوندەکانی کانی کوردە، قولگولە و نۆدۆلۆک دوو پیاو کوژران و دوو ژن بریندار بوون و، چل مانگا و ٢٠ ئەسپیش کوژران.

١٤- لە حاجی مەلا چەند خانوویەک و مزگەوتی گوندەکە کاول کران.

١٥- ئەم تاوانانەی کە لەسەرەوە باس کران لەلایەن سوپا و جاشەوە بەسەرکردایەتی سوپای تەها ئەلشەکەرچی کران. لە کاتی وێرانکردنی چنارۆک کە دەکەوێتە دامێنی چیای هەیبەت سوڵتان ئەو کابرایە ١٢ کەسی کوشت و ١٢٠ ژن و پیاوێکی پیریان بەناوی حاجی عەزیز گرت و ناچاریان کردن کە بەشاخەکەدا هەڵگەڕێن بۆ ئەوەی رێگا لە پێشمەرگە بگرن کە جارێکی تر شاخەکە بگرنەوە.

١٦- پیاوێکی پیر بەناوی عەبدولڕەحمان حاجی ئەسەد ئەلچەلەبی کوژرا و پاشان بەبەرچاوی ژن و کچەکانیەوە، کوڕەکەشیان کوشت. ژن و کچەکانی توانیبوویان خۆیان رزگاربکەن لەگەڵ ئەوەی کە سەربازەکان تەقەشیان لێ کردبوون.

١٧- دوو کەس، ئیبن بوستانی و عارف ئاغایان بەعەمودی تەلەفۆنەوە هەڵواسیبوو.

١٨- چوار سەد خانوو بەتەواوەتی خاپوورکران و پێنج سەد و چلی تریش زەرەریان پێ گەیشتبوو، پاشان سەربازەکان کەرەستەی خانووەکانیان بۆ دروستکردنی سەربازگەیەک بەکارهێنابوو.

١٩- دەوڵەت خەڵکی سفیلیان تالان کردبوو لە ناوچەکە و چل و نۆ هەزار حەیوانیان بردبوو، و حەوت هەزار کیسە توتنیان سووتاندبوو.

٢٠- چوار دەوری گوندی شێخ مەنسووریان گرتبوو، خەڵکەکەی خۆیان لە مزگەوتەکدا حەشار دابوو. هەموو خانووەکانیان سووتاندبوو، دەیان منداڵیان هەڵدابووە ناو ئاگرەکەوە.

١٢- گوندی خەلەکان سووتێنرابوو، کوێخای گوندەکە کەریم کوێخا ئەحمەد

بەبۆمب گیانی لەدەست دابوو.

٢٢- ژن و منداڵێک لە گوندی نیلەلا کوژرابوون.

لە ماوەی ئەم هەموو ساڵەدا بۆردومان کردن و تالانکردنی گوندە کوردییەکان درێژەی هەبوو، لەگەڵ پاکتاوکردنی خەڵکەکەی. ئەم ڕووداوانەی کە لەخوارەوە باسیان لێوەدەکرێت لەلایەن سەربازانی عێراقی و جاشەوە، لە تەلەگرامی سەربازییەوە کە خوێندراونەتەوە، بەدەست خراون. بەوردی باسکردنی ئەم بەسەرهاتانە چەندین لاپەڕەی دەوێت، بۆیە ئێمە تەنها باس لە هەندێکیان دەکەین.

## هێزە نوێیەکانی دەوڵەت

هێزەکانی دەوڵەت لە دوا شەڕی ڕەواندزدا لە مانگی نایاری ١٩٦٦دا، ئامانجیان ئەوە بوو کە شاخی زۆزک بخەنە ژێر دەستی خۆیان. بەڵام لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە پاشەکشەیان پێکرا. ئەمە وای لە بەرپرسیارانی سوپا کرد کە تاکتیکێکی تر بەکار بهێنن، بۆ نمونە ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵی کورد بگرن کە لە کەسوکاری پێشمەرگە پێک دەهاتن، لە نێویاندا خێزانی عەبدولڕەحمان عەلی قازی هەبوو کە سەرتیپ بوو. ئەو پێشتر لە سوپای عێراقدا سەرتیپ بوو، ئێستاش ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی شۆڕش و ڕاپەڕاندن بوو. هەروەها خێزانی ئیبراهیم ئەفەندیش لەناو گیراوەکاندا بوو. ئەویش پێشتر بەرپرسێکی پۆلیسی عێراقی بوو، ئێستاش بەرپرس بوو لە هێزی ئازادی لە ناو شۆڕشدا.

ئەو لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٦دا کوژرا. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە کەسوکاری پێشمەرگە گیران. هەموو ئەمانەیان سواری سەیارەی سەربازی کردبوو بۆ ئەوەی بیانبەن لە پێش سوپای عێراقیەوە دایان بنێن، بۆ ئەوەی کورد ناچاربکرێن تەقە نەکەن. یان دەبوو ڕێگا بەسوپا بدرێت شوێنەکان بگرێت یانیش کەسوکاری پێشمەرگەکان سەریان تیا دەچوو. لەناو ئەو گیراوانەدا شەش کچی تەمەن دوو ساڵ هەبوون لەگەڵ کچەکەی عەبدولڕەحمان قازی، کە باوکی لە شۆڕشدا کوژرابوو. خێزانەکان هێنرانە چیای زۆزک.

## ئەو هێرشانەی کە یاسا نێونەتەوەییەکانیان دەخستە ژێر پێ

لە ئاداری ١٩٦٦دا، ڕژێمی عێراقی گازی ژەهراوی لەدژی خەڵکی سڤیلی کورد بەکارهێنا. ئەم کارەش لەدژی گوندی ئاسناو لە ڕۆژهەڵاتی شاری پێنجوێن کرا، ٢٨ بۆمبیان بەسەر ئەو گوندەدا خستە خوارەوە، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی دەیان نەخۆشی لەوانە: سک ئێشە، فرمێسک هاتنەخوارەوە، ناڕەحەتی قورگ، کۆکە و ئازاری تر کە چەندین کاتژمێری دەخایاند. ژمارەیەک منداڵ مردن.

لە ١٧ و ٢٥ ئاداردا هەمان گاز بە ٥٠ بۆمب بەسەر گوندی پێری و بەڵان لە ئاکرێ، باراندران. ژمارەیەکی زۆر منداڵ کوژران و نزیکەی سەد کەس بەدەردی ئەو خەڵکەی لای پێنجوێن چوون کە لەسەرەوە باسمان کرد.

## بۆردومان

فڕۆکەکانی عێراق ئەم گوندانەیان بۆردومان کرد:

گوندەکانی بیستوانا، بالی و کەرەک لە ناوچەی ڕەواندز، شەدەڵە و سووورداش. ئەم بۆردومان کردنانە زەرەری زۆری ماڵی و خان وێرانکردن و مەڕومالاتی بەدواوە بوو.

لە ١٠ی ئەیلولی ١٩٦٥ دوو گوندی ماران و حەمزەبەگ لە پارێزگای هەولێر بەناپاڵم بۆردومان کران. سێ خانوو وێران کراو و منداڵێک کوژار. بەتۆپ و تەیارە و دەبابە گوندەکانی ناوچەی قەرەداغ لەوانە کفری، جەباری، هەروەها دوکان و بادینان بۆردومان کران.

لە هەشت و نۆ و دە و یازدە و دوازدەی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥ پەنجا گوند وێران کران لە ناوچەکانی، جەباری، زەنگەنە، سەنگاو و گەرمیان کە بووە هۆی بێ لانە و خانەکردنی هەزاران خێزان، ئەویش لە هێرشی جاش و جەیشدا. دەرەجەدارانی سوپا دەڵێن کە دەوڵەت فەرمانی دابوو هەموو گوندەکان لەگەڵ زەویدا تەخت بکرێن.

لە ١٤ تشرینی یەکەمدا گوندەکانی شەدەڵە و سەرگەڵوو لەناوچەی سووورداش بۆردومان کران.

لە ١٦ و ٢٢ و ٢٧ تشرینی یەکەمی ١٩٦٥دا گوندەکانی دێگەڵە، بۆلاک، تەکیە، تەرداخ ، کۆشان، کۆشک، شیوە شێن، مینقا و کۆمتان، بۆردومان کران.

لە ڕۆژی ١، ٨، ١٣و ١٤ تشرینی دووەمی ١٩٦٥دا گوندەکانی هۆنەر قام، پیرەمەگروون، هەڵەدن و دوو گوندی تر لە ناوچەی دۆسکی، بۆردومان کران و بووەهۆی کوشتنی ژمارەیەک ژن و منداڵ.

لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ جەژنی قوربان لە بەهاری ١٩٦٥دا دایکێک کە خەریکی گۆڕین و شتنی منداڵەکانی بوو، فڕۆکە مێگەکانی ڕژێم

ناوچەکەیان بۆردومان کرد و، یەکێک لەمنداڵەکانی کوژران.

لە ١٤، ١٥، ١٧، ٢١، ٢٣، ٢٥ و ٢٦ گـولانی (مـای) ١٩٦٥ ئەم گوندانە بۆردومـان کران: چۆمان، شەدەڵە، ڤالی، ڕێزان، پێنچڤێن، مەرگە، هەڵشـو، دزە و سـۆسـتلی کـە بووە هۆی کـوشـتنی ٧ ژن و دوو منداڵ و پیاوێکی پیر.

لە ٢٨ گولانی ١٩٦٥ دا مێگەکانی عێراق گوندی سۆریایان بۆردومان کرد کە دەکەوێتە نێو سنووری باکوری کوردستانەوە (تورکیا)، کەسێک کوژرا و دە کەسیش بریندار بوون و گەلێک خانووش وێران کران. ڕژێمی تورکی بەتوندی نارەزایەتیان بەرانبەر دەوڵەتی عێراق نیشان دا.

لە ئابی ١٩٦٥ دا گـوندی ئازەنێن بۆردومـان کـرا، دوو ژن و منداڵێک کوژران و حەڤدە کەسیش بریندرا بوون.

لە ١٥ و ١٨ نیسـانی ١٩٦٥دا ناوچەکانی سەرگەڵو، خورماڵ، گۆردی و بەرزنجە بۆردومان کران.

لە ٤ و ٦ ئاياری ١٩٦٥ و ١٦ و ١٩ ئاداری ١٩٦٦دا گـوندەکـانی بایزئەحیا، پشت ئاشان، سۆرادی، دۆسکی و پەری بەناپاڵم بۆردومان کران و ژمارەیەک ژن و منداڵ کوژران لەگەڵ ژمارەیەک حەیوانات.

لە مانگی ئایاری ١٩٦٦ دا، پاکتاوکردنی نەژادی خەڵکی سڤیلی کورد لەو ناوچانەی کە گەمارۆدراون درێژەی هەبوو. لە گـوندی زەواکی سێ ژن ومنداڵێک کوژران و، ژنێکیش بریندار بوو بوو.

لە ئایاری ١٩٦٦ ڕووداوێکی دڵتەزێن ڕوویدا، ژمارەیەک لە قەرەجەکان (دۆمـەکـان، ئەوان ئێسـتـا وا ناوی خـۆیان دەبەن-وەرگێـڕ) دەیانویست بگوێزنەوە لە نێوان ڕێگای حاجی ئۆمەران بەرەو دەربەندیخان. فڕۆکەکانی عـێراق بۆردومـانی ئەو خـەڵکەیان کـردبوو کـە بووە هۆی کـوشـتنی ١٨ لە قەرەجەکان و بریندارکردنی ١١ی تر کە زۆربەیان منداڵ بوون.

لە ١٩ و ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٦٦دا بادینان و ناوچەی کۆیەیان بۆردومان کرد.

ڕژێمی عێراق لە ڕۆژەکانی ٤، ٦، ٨، ١٠، ٢٠، ٢٢، ٢٤، و ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦دا بەفڕۆکە ئەم شوێنانەی بۆردومان کرد و ئەم زیانانەی لێکەوتەوە:

گوندەکانی بادیان، هیران و نازەنین، کاموسک، دۆلی، زاخە، نامێدی، خاراپ، بیرواڤیکیش و دەرگەڵە، کە بووە هۆی کوشتنی ١٤ ژن و پیاو، بریندارکردنی منداڵ و ژنێکی دووگیان. ژمارەیەکی زۆر حەیوانات کوژران و دەغڵ و دانێکی زۆر سووتێنران.

کۆچپێکردنی زۆرەملێی خەڵکی سڤیلی کورد لە نێوان نیسان و ئابی ١٩٦٥دا درێژەی هەبوو. هەزاران خێزانی کورد لە ناوچەکانی زاخۆ لە ماڵەکانیان دەرکران و ماڵ و کەرەستەکانیان دەستیان بەسەردا گیرا یانیش کاول کران. هەموو گوندەکانی ناوچەکانی سمێل و بادینان و دوزخورماتوو و سووورداش و شەربان، کاول کران. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەو ناوچانە پەنا بەرنە بەر شاخەکان.

زۆربەی کوردەکانی مووسڵ دەرکران، خانووەکانیان دەستیان بەسەردا گیرا، ئەم کردەوەیە ئەو خەڵکانەشی گرتەوە کە پشتیوانیان لە ڕژێم نەدەکرد. دانیشتووانی سڤیلی کورد لە شاری مووسڵ لە ڕەوشێکی نائاساییدا دەژیان، لە ترسی پۆلیسی نهێنی ڕژێم. سەربازێک کەسێکی بەناوی عوسمان عارف لە دوکانەکەی خۆیدا کوشتبوو، تەنها لەبەرە ئەوەی حەزی لە چارەی نەکردبوو.

ژمارەیەکی زۆر لە خێڵە کوردەکان هەڵتەکێندران و لە جێگای ئەواندا خەڵکی عەرەبیان نیشتەجێ کرد.

لە ساڵی ١٩٥٨ شارێکی نوێ (نووسەر ناوی ئەو شارەی بە Kukuk ناو زەدکردووە کە نازانم مەبەستی کام شارە- وەرگێر) بنیاتنرا، کە

دانیشتووانەکەی کورد بوون و ژمارەیان دوازە هەزار کەس دەبوو. کاتێک لە ساڵی ١٩٦٣ شەڕ دەستی پێکردەوە، زۆربەی زۆری خەڵکەکەی ناچارکران شوێنەکانیان بەجێبهێڵن، بەبێ ئەوەی مۆڵەتی ئەوەیان پێ بدرێت کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرن. لە ماوەی چەندین هەفتەدا ئەو خەڵکە بێ جێگاوڕێگا لە جادەکاندا دەسووڕانەوە. ژمارەیەک منداڵ گیانیان لە دەست دا لە کاتی ڕاگوێزانیان بەسەیارەی سەربازی. پاشانیش ئەو خەڵکە ئاوارانەیان گواستەوە بۆ سلێمانی. لە ڕێگا ٦٥ لەو سەیارانە لەلایەن پێشمەرگەوە گیران و خەڵکەکانیان بەرەو ناوچە ئازادکراوەکان برد. دوای ئەوەی کە ڕژێم بەوەی زانی ژمارەیەک فڕۆکەی جەنگیان ناردە سەریان بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ئەو سەیارانەی کە لەلایەن پێشمەرگەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو، ئەوەش بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەک منداڵ. ئەفسەرەکان ژمارەیەک منداڵ و کچیان دەستگیر کرد، تا وەکو کۆیلە لەماڵەکانی خۆیاندا بەکاریان بهێنن. ژمارەیەکی زۆر خێزان تائێستاش بەدوای منداڵەکانیاندا دەگەڕێن.

بۆ ئەوەی کورد تەعریب بکەن، ٢٨٠٠ خێزانی عەرەبیان هێنا بۆ کەرکووک و ناوچەی شوان، ئەمەش بەشێک بوو لە بەرنامەی ڕژێم، بۆ تەعریبکردنی کوردستان.

## گوندە سووتاوەکان

گوندی بۆسکین کە لە ٢٢٠ ماڵ پێکهاتووە و ژمارەی دانیشتووانەکەی تێکڕا لە ١١٦٠ کەس پێکهاتوون، دوو جار لە لایەن ڕژێمی قاسم و ڕژێمی بەعسەوە سووتێنراوە، خەڵکەکەی دوو جار گوندەکەیان دروست کردۆتەوە، بەڵام لە ٢٨ نیسانی ١٩٦٦دا جارێکی تر گوندەکە لەلایەن لەشکری بیستەوە هێرشی کرایە سەر و بەبەر چاوی خەڵکەکەیەوە سووتێنرا.

لە ١٢ نیسانی ١٩٦٦دا لەلایەن جاش و جەیشەوە هێرش کرایە سەر گوندەکانی خورماڵ، کیردیگۆ و تیپرزینۆ، نۆ کەس کوژران کە دووانیان منداڵ بوون.

لە ٣٠ی ئادار و ٢٠ی نیسان و ١١ ئایاری ١٩٦٦دا، هێرش کرایە سەر دەشتی شارەزوور، کانی بەردینە، دەشتی هەولێر، هەمزەبەگ، شیروانە و کێوی پیران، کە لەو هێرشانەدا شار تێک دران و تاڵان کران و مرۆڤیش کوژران.

لە ژێر فەرماندەیی قانێن میسباح، لەشکری بیست لە ٢٠ی ئایاری ١٩٦٦دا هێرشی کردە سەر گوندەکانی کفردۆڵ، سەروچاوە، حاجی تودا، مەروە و تیبرشاوا، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ناوچانە لەژێر دەستی پێشمەرگەدا نەبوون. لە گوندی سەروچاوە ٩٦ کەسی سڤیل کوژران، کە دوو ژن و چوار منداڵیان لەنێودا بوو. یەکێک لە منداڵەکان بەسنگی دایکیەوە بوو بوو کاتێک سەربازەکان دایکەکەیان کوشتبوو.

پیاوێک بەناوی ئیبراهیم لاجان و کورەکەی و براکەی بەناوی ئەحمەد لاجان کوژرابوون. لە کاتێکدا کچەکەشی ویستبووی ناو بکات بەدەمی باوکیەوە، ئەویشیان کوشتبوو.

## ڕووداوەکانی سیلانی لە بەهاری ١٩٦٥دا

ئەم گوندانەی خوارەوە هێرشیان کرایە سەر و بۆردومان کران:

١- کرۆینی: دوای ئەوەی کە ئەشکەنجە دەدرێن ئەم خەڵکانە دەکوژرێن ئەمەش ناوەکانیانە: فەرموو ڕەشید، شەریف میرۆ، مەمۆ دیلیا، میرۆ تەمیر، عەلی عیسا، عیسا بیرخۆ.

٢- کرۆلا (گوندێکی مەسیحیە): بەکرێگیراوی عەرەب موختاری گوندەکە و کوڕلان گۆزالیان کوشتبوو، چونکە ئەیان ویستبوو پارە بدەن بەو بەکرێگیراوانە.

٣- کیراب دیم: سەربازانی عەرەب حەمید ئیبراهیمیان کوشتبوو.

٤- باتاس: پیاوێک بەناوی عەبدولڕەحمان عەبدولڕەزاق کوژرابوو و هەموو شتەکانیشیان بردبوو.

لە ماوەی سێ ڕۆژاندا ئەم گوندانە سووتێنران و کاول و وێران کران، لەم هێرشانەدا پۆلیس و دەبابە بەشداریان کرد:

١- کورددەوەن ٢- بیرافۆک ٣- کیشخان ٤- سەرکار ٥- کۆمبەل ٦- بیچیک ٧. قەڵای مەلا تەیب ٨- خراپدەم ٩- مێرگەسوور ١٠- پەنێری ١١- ئیملاک ١٢- کانی کەرەک ١٣- دۆستانە ١٤- بخلۆخە ١٥- ماشرا ١٦- سوریا ١٧- چەم زراف ١٨- کیرۆش ١٩- بازێدکنەک ٢٠- خەرابدار ٢١- سیلکێ ٢٢- خەلیژ ٢٣- باکریا ٢٤- باخۆکە ٢٥- توران ٢٦- هیتیان.

دانیشتووانی ئەم گوندانە لە ناوچە سەربازیەکانی ناوچەی باستکی، هاسە، چەمکۆک و زاخۆ کۆکرابوونەوە.

٥- شاری زەمار، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕوباری دیجلەوە تاڵان و وێران کرا، هەروەک گوندەکانی چەم باحیف و ماسکا و هی تر. سەدان خێزان ناچارکران ماڵ و حالیان بەجێ بهێڵن و ڕووبکەنە ناوچە ڕزگارکراوەکان.

٦- بێجگە لە پاکتاوکردن، فەرمانی دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکە درا، کە ژنانیشی دەگرتەوە.
٧- ژمارەیەکی زۆر لە خێزانی پێشمەرگە و ئەوانەی کە تازە پەیوەندیان بەپێشمەرگەوە کردبوو، ناچارکران ئیمزای ئەوە بکەن کە هیچ پەیوەندییەکیان بەپێشمەرگەوە نییە.

سوپای عێراقی هێرشی کردە سەر دانیشتووانی زاخۆ و سواری سەیارەی سەربازیان کردن و فەرمانیان پێدان بچن لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندا خۆیان بژێنن.

لە ٢٧ ئایاری ١٩٦٥ دا هێزەکانی ڕژێم هەموو گەنمی ناوچەی خانەقینیان سووتاند، کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێم خۆیدابوو، خەڵکەکەی بەوە تاوانبار دەکرد کە هاوکاری پێشمەرگە دەکەن. لە ئابی ١٩٦٥ دا، گوندەکانی بەردەزەرد، میکۆگان و هەرمان سووتێنران. خەڵک کوژران و گوندەکانیش تالان کران.

لە یاداشتنامەی ژەنەراڵ بارزانیدا ناوی ٢٦٨ گوند هاتبوو کە سووتێنرابوون. ئەو گوندانەی کە لەسەرەوە ناویان هاتووە، لەو لیستەیەدا نین. سەدان گوندی تریش سووتێنراون کە ئێمە ناومان نەهێناون. لە خوارەوە ناوی ئەو گوندە مەسیحیانەی کە سووتێنراون بەکڵێساکانیشیانەوە دەخەینە پێش چاو:

١- کڵێسای ناو شاری ئامێدی و کتێبخانەکەی و قوتابخانەی مەسیحییەکان- ٢- گوندی کوانی و کڵێساکەی- ٣- گوندی دەری- ٤- گوندی هێزێک و کڵێسا پەمەیەکەی- ٥- گوندی بینانە و کڵێساکەی- ٦- گوندی ئەمشکی و هەردوو کڵێساکەی- ٧- گوندی ناردن کە لە دێرزەمانەوە ناوەندی مەسیحییەکانە و دوو کڵێسای تێدابووە- ٨- گوندی دوودیا- ٩- گوندی بادشتێ و کڵێساکەی- ١٠- گوندی مازی و کڵێساکەی- ١١- گوندی ئاتوش و کڵێساکەی- ١٢- گوندی نارکان و

کلێساکەی- ١٣- گوندی سیان و کلێساکەی- ١٤- گوندی بابالفە ١٥- بارینجا- ١٦- گوندی سوداف ١٧- گوندی سکری- ١٨- هەسن- ١٩- گوندی مالا عەرەب- ٢٠- گوندی تەل-نەکبەر ٢١- گوندی شەفکەتارا ٢٢- گوندی ماحمەدیک ٢٣- گوندی قرالۆ ٢٤- گوندی بافلۆیا ٢٥- گوندی نافزیرۆکی ژوورو ٢٦- گوندی نافسیرۆکی ژێری ٢٧- گوندی بەیاد ٢٨- گوندی باکیرات ٢٩- گوندی هازیرکی ٣٠- گوندی ڕەیپی ٣١-گوندی سورکە ٣٢- قەشفەر و کتێبخانە مەسیحیەکەی ٣٣- گوندی بۆنداوا و کلێساکەی.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر مزگەوتیش لە کاتی بۆمبارانەکەدا ڕووخان، لە نێویاندا دەتوانین ناوی مزگەوتی گەلالە بەرین. هێشتا نوێژی نیوەڕۆ دەستی پێنەکردبوو، سەدان کەس لە خواپەرستان کە لەناو مزگەوتەکەدا بوون بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر نەجاتیان بوو.

## دەستگیرکردن و زیندانی کردن

لە پاڵ هەمــوو ئەم تراژیدیانەی شــەڕدا، هەزاران کــورد بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکیـان کردبێت دەسـتگیـردەکرێن و لە زیندانەکـان توند دەکرێن بەبێ دادگـایی کـردن. ژمـارەیەکی زۆر لەوانە مـاوەیەکی دووررودرێژ لە زینداندا دەهێـڵـرێنەوە. خـێـزانی ئەو گـیـراوانە بەبێ سـەرپەرشت و بەبێ ئەوەی کەسێک هەبێت هاوکاریان بکات، دەهێـڵدرێنەوە و هەمیشـە لە ژێر زۆر و ستەم و دووچاری ئەشکەنجەدان دەبنەوە. دانیشـتـووانی شـارەکان دەتوانن باسی زۆر لەو سـەحنانە بکەن کـە تووشـیـان هاتوون، کـاتێک هێـزە عێراقیـەکان دەسـتی زیندانییەکانیـان دەبەستەوە و بەدوای زرێپۆشەکانیان ڕاپاندەکێشـان و لە قەراخ شۆستەکاندا فرێیان دەدان. زیندانیـەکان هەتا بڵێی بەشێوەیەکی خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا و دووچاری نەخۆشی دەهاتن.

## گوندە کوردییەکان خوێندنگا و خەستەخانەیان تێدا نییە

شتێکی ڕوون وئاشکرایە کە هەزاران گوندی کوردی لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی شەڕدا لە خوێندنگا و خەستەخانە بێ بەری کراون. هێزەکانی عێراقی ژمارەیەکی زۆر لە خوێندنگاکانیان بۆردومان کردووە و ڕژێم هەموو خوێندنگاکانی لەناوچە ئازادکراوەکاندا داخستووە، یەک ملیۆن مرۆڤ لەو ناوچانەدا دەژین. شۆڕشگێرانی کورد نەیانتوانیوە ئەو خوێندنگایانە بخەنەوە گەڕ. بەشێکی کەم بەهۆی باری ئابوورییەوە، بەشێکیش بەهۆی ئەوەی کە ئەوان ناتوانن ناوچەکان لە هێرشی عێراقییەکان بپارێزن، کە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا بەبەردەوامی بۆردومان کراون.

لەو ناوچە ئازادکراوانەی کە یەک ملیۆن مرۆڤ لێی دەژین، بەدەگمەن دەتوانیت دەرمان یانیش خەستەخانەیەک پەیدا بکەیت. دامودەزگا دەوڵەتییەکان دەست بەسەر هەر جۆرە دەرمانێکدا دەگرن کە لەو ناوچانە و تەنانەت لەناو شارەکانیشدا بێت. ئەوەش بۆ ئەوەیە کە ئەوان نایانەوێت دەرمان بۆ ناوچە ئازادکراوەکان بنێردرێن. تەنها چوار دوکتۆر و چەند جێگرێک کە پەیوەندیان بەپێشمەرگەوە کردووە، هاوکاری قوربانییەکانی شەڕ دەکەن، ئەویش بەو برە کەمە دەرمانەی کە پێشمەرگە بەهەزار دەردە سەری لێرە و لەوێ پەیدای دەکەن.

## بەڵگە

لە خوارەوە ئەو فەرمانانەی کە بەشێوەی تەلەگراف نێردراون و کەوتوونەتە دەست شۆڕشی کورد، نیشان دەدەین. ئەم تەلەگرافانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە چۆن ڕژێمی عێراقی فەرمانی لەناوبردنی خەڵکی سڤیلی کوردستانی عێراقیان داوە.

ئەمەش دەقی قسەکانی نێوان سەرلەشکرێک و لەشکری ۲۷ ی کۆماندۆی عێراقییە:

کۆماندار: هەلەو سەرلەشکر عەبدولڕەزاق، چۆنن؟ ئایا شەڕ هەر بەردەوامە؟ فڕۆکە مێگەکان ئامانجەکانیان پێکاوە؟ پێویستیتان بەیارمەتییە؟ هەموو گوندەکان بەئاگری تۆپخانەکان خاپوورکراون؟ ڕەحم بەو جولەکانە مەکەن. هەرچییەکتان بەردەستەکەوت تالانی کەن و پاشان بۆ منیان بنێرە؟

سەرلەشکر عەبدولڕەزاق: شەڕ هەربەردەوامە و تەیارەکانیش بەچاکی بۆردومان دەکەن. تۆپخانەکانمان ئەو گوندانەیان خاپور کردووە، کە پێشتر باسمان کردبوون. تکایە هێزی هاوکاریمان لە دەربەندیخانەوە بۆ بنێرن تا بەهانای (ڕەعد)ەوە بێن کە لەلایەن پێشمەرگەوە دەوریان گیراوە. بەڵێ، هەروەک ئاماژەتان پێ کرد هەرچیەکمان بەردەست بکەوێت تالانی دەکەین، بەڵام تا ئێستا هیچ کوژراوێکمان نەدۆزیوەتەوە.

کۆماندار: ئەی ئەو کوژراوانەی کە لە تەلەگرافەکەدا باستان کردوون چیان بەسەر هاتووە؟ دەبێت چەند کوژراوێکمان بۆ بنێرن!

سەرلەشکر: بەڵێ، هەوڵدەدەین.

سەرکۆماری ئێستا عەبدولڕەحمان عارف، ئەو کاتەی کە سەرۆکی سوپا بوو، بەفەرمانی ژمارە ۲۷۸ لە ڕۆژی ٦ حوزەیرانی ۱۹٦٥ دا، فەرمانی دابوو:

١- هەموو ئەو کێڵگانەی کە لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدان، دەبێت خاپوور بکرێن.

٢- هەموو بەروبوومی ئەو جوتیارانەی کە پەیوەندی بەپێشمەرگەوە دەکەن دەبێت دەستی بەسەردا بگیرێت.

ئەو تەلگرافانەی کە تیایاندا هاتووە گوندە کوردییەکان بۆردومان بکرێن:

١- لە هێزەکانی مەزهەرەوە بۆ لەشکری دوو (ژمارە ٨١، ١٩٦٥/٩/١)، ئایا هەموو گوندەکان بسووتێنین، ئاگادارمان بکەنەوە!

٢- لە هێزەکانی مەزهەرەوە بۆ لەشکری ٢(ژمارە ٣٣، ١٩٦٥/١١/٩)، گوندی مۆردخودامان سووتاند. دەبێت هێزە هەواییەکانیش گوندی نەبەرکان بسووتێنن.

٣- لە یەعرووبەوە بۆ لەشکری ٢ (ژمارە ٥، ١٩٦٥/١١/٩)، دامودەزگا هەرێمیەکان ئامادەن هەموو گوندەکان بسووتێنن. تکایە فەرمان بەسوپا بدەن.

٤- لە سوپای دووەوە بۆ هەموو هێزەکان: تکایە ناوی ئەو گوندانەمان بۆ بنێرن لەو ناوچانەی کە دەبێت بەناپاڵم یانیش لە رێگای تۆپخانەکانمانەوە کاولیان بکەین.

٥- لە لیوای دووەوە (ژمارە ف، ١٩٦٥/١١/٩)، ئاگادارتان دەکەینەوە کە گوندەکانی ئەسکەندەر بەگی و دەلوسنمان سووتاند. بۆ سوفیان و هەموو هێز و بەتالیۆنەکان، توانیمان گەمارۆی گوندی مالیش بدەین و ئێستا لە ژێر کۆنترۆلی ئێمەدایە. کاتژمێر یازدە و چل و پێنج دەقیقە، دەست بەسووتاندنی دەکەین.

٦- لە هێزەکانی یەعرووبەوە بۆ لەشکری ٢(ژمارە ٢٠، ١٩٦٥/١١/١٢)، ئەم گوندانەمان لەژێر دەستدایە، کاولمان کردوون. گوندی کارۆ، گوندی کۆی تەپە، گوندی کانی هەنجیر.

٧- لە لەشکری دوورەوە بۆ ناوەندی هێزی هەوایی کەرکووک (ژمارە ٩٢، ١٩٦٥/١١/١٢)، تکایە جارێکی تریش بەناپاڵم گوندەکانی قەمچووخە و سەرموورد، بۆمباران بکەنەوە.

٨- لە هێزەکانی یەعرووبەوە بۆ لەشکری دوو (ژمارە ٢٢، ١٩٦٥/١١/١٢)، لە پەیوەندی لەگەل تەلەگرافی ڕۆژی ١١/٨، گوندی بۆلقامیشمان وێران کرد.

٩- لە هێزەکانی عیمادەوە (ژمارە ٢٢، ١٩٦٥/١٢/٨) بۆ هێزەکانی مەنسوور، داواتان لێدەکەین ئەم گوندانە بەناپاڵم بۆردومان بکەن. گوندی کانی سوور، گوندی ڕەسووڵ بچکۆل، گوندی خۆرە.

١٠- لە هێزەکانی ئالاوە بۆ هێزەکانی مەنسوور (ژمارە ٤٣، ١٩٦٥/١٢/٨)، ڕەوشی ڕووداوەکان هەتا کاتژمێر ٩ بەم شێوەیە. گوندەکە دەسووتێت، جاشەکان تا ئێستاش خەریکی ئاگرتێبەردانی ئەو شوێنانەن کە نە سووتاون. زیاتر لە شەش لاشەی پێشمەرگە لە ناو ئاگرەکەدا دۆزراونەتەوە.

ئەم فەرمانانەی خوارەوە لە مەڕ هێزە شەڕانییەکان، لە سەرکردایەتی هێزەکانی مەیدانییەوە. نهێنی و بەپەلە:

١- دەبێت بەتەواوەتی ڕێگا لە دزەکردنی دەرمان لە کەرکووک و لیوای هەولێر و سلێمانییەوە، بگیرێت، بۆ ئەو شارە بچووکانەی کە سەربەو شوێنانەن، هەروەها دیالە و خانەقینیش. دەبێت تەنها ڕێگا بەو نەخۆشانە بدرێت کە مۆڵەتی دوکتۆریان پێیە. ئەم فەرمانە دەبێت بەتەواوەتی جێبەجێ بکرێت بەهاوکاری دامودەزگاکانی سوپا، هەروەک چۆن لە پارێزگای مووسڵ ئەنجام دەدرێت.

٢- دەبێت بەووردی چاودێری فرۆشتنی دەرمان بەنەخۆشەکانیش بکرێت. بەرپرسیارانی سوپا و کەتیبەکان، دەتوانن ڕێنوێنیتان بکەن لەوەی کە بەچ شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەن و بەچ شێوەیەک دەرمانەکان دابەش بکرێن. دەبێت بەرپرسیارانی خەستەخانەکان لە هەموو ئەو

پارێزگایانەدا ئاگادار بکەنەوە، کە دەرمانخانەکان ئەو ڕەچەتانەی کە دەرمــانی پێ دەفــرۆشن لەلای خــۆیان هەڵبگرن و نابێت دەرمــان بەکەسێک بفرۆشرێت کە ڕەچەتەی شوێنە ڕەسمیەکانی پێ نەبێت. ماوەی نێوان ئەو کاتەی کە ڕەچەتەکەی لێ نووسراوە تا ئەو کاتەی دەرمانەکە دەکڕدرێت نابێت لە چل و هەشت سەعات زیاتر بێت، ئەگەر نا دەبێت ڕەچەتەکە لەلایەن هەمان دوکتۆرەوە کە نووسیویەتی نوێ بکرێتەوە.

٣- دەبێت ئەو کەسانەی کە مۆڵەتی دەرمان فرۆشتنیان هەیە لەو شارانەی کە ناومان هێنان و شاری خانەقین و شارەکانی تری سەر بەو پارێزگایانە، لیستەی ئەو دەرمانانەی کە وەری دەگرن بۆ فرۆشتن بدەن بەلەشکری پێنج بەدوو نوسخە، دانەیەکیان لای خۆیان بهێڵنەوە. هەموو داودەرمانێک دەبێت لەژێر کۆنترۆڵی سوپای پێنجدا بگوێزرێتەوە و لەژێر چاودێری و فەرمانی ئەواندا بەکاربهێنرێت.

## هەندێک لە کەسایەتییەکانی کورد

### عەلی حەلۆ

ناوم عەلی حەلۆیە، فەرماندەم لە سوپای پێشمەرگەدا. لەو ماوەیەی کە ئاگربەست بوو لە نێوان ئێمە و حکوومەتدا، گەڕامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان و لەگەڵ ژن و دوو کچەکەمدا لەوێ مامەوە.

شەوێکیان کە هەموومان لە دەوری ئاگردانەکەمان کۆبووبووینەوە، بۆمبایەکیان لە لوولەی زۆپاکەوە خستە خوارەوە بۆمان و تەقییەوە. کاتێک بەخەبەرهاتمەوە، تەنها بووم، ژن و منداڵەکانم جارێکی تر بەخەبەر نەهاتنەوە. ئەو خامەی کە لەسەر چاومە، هەمیشە ئەو کارەساتە و ژن و منداڵەکانم بەبیردەهێنێتەوە لەگەڵ ئەو چاوەی کە لەدەستم دا.

ئەو تراژیدیایەی کە بەسەریان هێنام، لە کاتێکدا بەرنامەڕێژیی بۆکرابوو، کە ئاشتی لەنێوان ئێمە و دوژمندا بوو. ئەو چاوە دەستکردەم لەلایەن ژەنەراڵ بارزانییەوە، بۆم بەدروستکردن درا، وەکو دڵ نەواییەک.

### عەلی سنجاری

ناوم عەلی سنجارییە و تەمەنم ٣٤ ساڵە، ژنم هێناوە و چوار منداڵم هەیە. تەکنیک کاری تەلەفۆناتم. تا ئەو کاتەی لە شاری مووسڵ لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیرکرام لە دائیرەی تەلەفۆناتی عێراق کارمەند بووم. لە نیوەشەوێکدا ژمارەیەکی زۆر سەرباز دایان بەسەر ماڵەکەمدا و دەستیان کرد بەپشکنین. لەگەڵ خۆیان ڕاپێچیان کردم، هەتا گەیاندمیانە گرتووخانە بەقۆنداغە تفەنگ لێیان دام.

تا بردمیان بۆ لێپرسینەوە، ئەشکەنجەیان دام، بەشێوەیەک کە لەهۆش خۆم چووم. بەئاوی سارد بەخەبەریان هێنامەوە. پاش نیو سەعات بردمیان بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، عیزەدین نافع لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردم.

داوای ئەوەی لێدەکردم کە دان بنێم بەوەی کە پەیوەندیم لەگەڵ

پێشمەرگەدا هەیە و ناوی هەموو ئەوانەیان پێ بڵێم کە سەر بەشۆڕشن. بەڵام من هیچ پەیوەندیەکم لەگەڵ پێشمەرگەدا نەبوو و کەسیشم نەدەناسی کە پەیوەندی بەشۆڕشەوە هەبێت.

نیتر عیزەدین وەکو شێت و هاری لێهات، فەرمانی بەو پێنج پۆلیسە دا کە لەوێ بوون، کە لەسەر زەویەکە ڕابکێشن، ئیتر دەستی کرد بەتێهەڵدانم لەسەر و دەموچاوم، هەتا خوێن لەدەم و لووتمەوە فیچقەی کرد. پاشان بردمیانە ژوورێکەوە کە گڵۆپێکی زەعیفی تێدا داگیرسابوو. ئەو پەڵە خوێنانەی کە هی ئەو زیندانیانەبوون کە پێش من بردوویانەتە ئەو ژوورەوە، بەدیوارەکەوە مابوون. لەسەر کورسییەک دایانام کە دوو پۆلیس لەم لاو لەو لاوە وەستابوون. زۆر بەنەرمی پێیان وتم کە دان بنێم بەو تاوانانەی کە منیان پێ تاوانبارکردبوو. تا سەعاتێک بەتەنها بەجێیان هێشتم، پاشان نافع هات و پێی وتم کە بڕیاریان داوە بمکوژن، ئەویش نەک بەفیشەک بەڵکو پارچە پارچەم بکەن هەتا دەمرم.

تەلێکی کارەبایان لە قاچی چەپم بەست، پاشان تەلێکی تریان لە کارەباکە بەست و خستیانە سەر لەشم و هەموو ماسولکەکانمی ڕاتەکاند. دوای ئەوەی سێ چوار جار ئەو کارەیان لەگەڵ دووبارە کردمەوە، دیسان لەهۆش خۆم چوومەوە. دوای ئەوە بۆ ماوەی پێنج سەعات کەوتنە لێدان و پرسیارکردن. دوا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەتەنها بەجێیان هێشتم، قاپێک شۆربای سوێر و پارچە نانێکیان دامێ. خواردنەکەم خوارد، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە ئاوم بدەنێ، کاتێک زانیم ئاوم پێ نادەن، چوومە لای پەنجەرەکەوە و داوای ئاوم کرد. سێ سەعات چاوەڕێم کرد، هەتا لەهۆش خۆم نەچووم ئاویان بۆ نەهێنام. کە بەهۆش هاتمەوە، کەسێک سەری بەرز کردبوومەوە و ئاوی دەدامێ. پیاوێک لەو لامەوە بەبەرچاومەوە ئاوی لە مەرکانەیەک دەردەهێنا و دەیخواردەوە. پەرداخەکەی لێ نزیک کردمەوە، کە ویستم دەستی بۆ بەرم و بیگرم، دەستی کێشایەوە و ئاوەکەی بەو ناوەدا هەڵپڕژاند.

بۆ جاری سێیەم نافع هاتەوە و وتی ئایا داواکاریەکم هەیە یان نا، منیش لە وەڵامـدا داوای ئاوم کـردەوە. ئەویش هەتا بۆم خـورایەوە ئاوی دامێ. پاشـان جگەرەیەکی دامێ، دەیویست ڕازیم بکات بەوەی کـە چی دەزانم پێیـان بڵـێم و ئەوانیش چیتـر ئەشکەنجەم نادەن. منیش لە وەڵامدا وتم ئێستـا لە ڕەوشێکدا نیم کە بتوانم قسـەت لەگەڵ بکەم، داوام لێکرد کە کەمێک مۆڵەتم بدات تا دەحەسێمەوە. دوو سـەعات مۆڵەتیان دامێ. پاشان نافع هاتەوە وتی ئەوان دەزانن کە من پارتیم و ناوی ئەو کەسانەش دەزانم کە پەیوەندییان بەپێشمەرگەوە هەیە. منیش پێم وت: ئەو کاتەی کە من پەیوەندیم پێیـانەوە هەبوو، پارتی دیموکراتی کوردستـان پارتێکی قەدەغەکراو نەبوو، بەڵام من هیچ پەیوەندییەکم بەپێشمەرگەکانەوە نییە لەو چیایانە.

پێم وت: من ناتوانم ناوی خەڵک بدەم و بەناهەق سزا و ئەشکەنجەیان بدرێت. دوای ئەو قسانەم، پۆلیسەکان دەستیان بەلێدانم کردەوە و ئاوی ساردیان پیاکردم، پاشان پانکەیەکیان هەڵکرد و بەقامچی بەربوونە وێزەم. بەم شێوەیە لە ماوەی سێ شەو و ڕۆژدا ڕووبەرووی ئەشکەنجە، خواردنی سوێر، لە کارەبادان، تینوێتی و سەرما و ئاوی سارد پیاکردنیان، کردمەوە.

ڕۆژی چوارەم نافع هات وەرەقـەیەکی بەدەستـەوە بوو، پێی وتم ئەوە حوکمی لە سێدارەدانمە کە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە ئیمزا کراوە. منیش پێم وت: کوشتنی من کارێکی ئاسانە، بەڵام کوشتنی دوو ملیۆن کورد کارێکی ئاسان نییە. دەست و چاویان بەستمەوە و سواری سەیارەیەکیان کردم بەرەو دەرەوەی شار بردمیان. لە شوێنێکدا وەستاندمیان، تا سێیان ژمارد و دەستیان کرد بەتەقە، ئەگەر چی من بریندار نەبووم چونکە ئەوان فیشەکەکانیان بەمنەوە نەدەنا، بەڵکو ئەوەش بۆ خۆی جۆرێک لە ئەشکەنجەدان بوو. دوای ئەوە لێیان پرسیم کە ئاخۆ بریندار بووم یان نا. منیش پێم وتن نەخێر. وتیان فیشەکمان پێنەماوە، بۆیە ناچارین کە هەڵتواسین. بەڵام گەڕاندمیانەوە بۆ پۆلیسخانەکە و پاشانیش بۆ زیندانێکی گەورە تر.

لە قاوشەکەدا، زیندانییەکان باسی ئەوەیان دەکرد کە عەلی سنجاری گیراوە، ئەوان نەیاندەزانی کە ئەوە عەلی سنجارییە لە پەنایانەوە دانیشتووە. منیش پێم وتن من عەلی سنجاریم، ئەوان بەدەنگ منیان ناسییەوە چونکە هەموو گیانم جێگای برین و پەڵە بوو. لە زینداندا فەرمانیان پێدابووین کە دەبێت ئاودەستخانەکان پاک بکەینەوە.

پاش شەش مانگ بەکەفالەت (پارە) ئازاد کرام. لەو ماوەی کە لە زینداندابووم دەستیان گرتبوو بەسەر هەموو ماڵ و موڵکێکدا کە هەمبوو. ژنەکەم کە عەرەبە لەگەڵ دوو منداڵەکەمدا چووبوونەوە بۆ ماڵی خەزوورم. هاوڕێیەکی خۆشەویستم کە عەرەب بوو، داوای لێکردم کە شار بەجێ بهێڵم و بڕۆم. ئەو بیستبووی کە پۆلیس نیازی کوشتنمیان هەیە. زاواکەم کە ناوی ئیبراهیم خدر حاجی یونس بوو، پۆلیسی عەسکەریی بوو، بەدزییەوە بردمی بۆ هەولێر و لەوێشەوە بۆ بەغدا. پاشان کە سوپا پێیان زانی یارمەتی منی داوە کە ڕابکەم، گرتیان و ئیعدامیان کرد.

ئەو ماوەیەی کە لەزیندان بووم لە مووسڵ و دهۆک و زاخۆ، زیندانی کرام. کە لە زیندانی زاخۆ بووم لەگەڵ ٥٢ کەسی تر لە ژوورێکی ٢٠ مەتر چوارگۆشەدا بووین، بەنۆرە دا دەنیشتین، بەشەو و بەڕۆژ، سەعاتێک دادەنیشتین و سەعاتێکیش بەپێوە بووین.

ڕۆژێکیان دوو جاش هاتن بۆ سەردانم لە زیندانی دهۆک، دەیانوت تۆ سەرلەشکری لە ناو پێشمەرگەدا، دەیانویست لەگەڵ خۆیان بمبەن و بمکوژن. بەڵام سەرۆکی زیندان کە لە مووسڵەوە دەمناسی، تەسلیمی ئەوانی نەکردم.

لە زیندانی مووسڵ، ١٢٥٠ کەسیان لە شوێنێکدا کۆکردبووەوە کە لە ڕاستیدا بۆ ١٥٠ کەس کرابوو. بۆمان نەبوو ڕیشمان بتاشین. ڕۆژی جارێک لە سەتڵێکی گەورەدا ناویان دەدایني. ئێمە پەنجا و دوو کەس لە ژوورێکدا بووین، هەموومان بەو سەتڵە ئاومان دەخواردەوە. خراپترین

خواردنیان دەداینێ کە لە ژیانمدا نەمخواردبوو. گەلێک جار خەڵکی جاسوسیان بەناوی زیندانییەوە دەنارده ناومان بۆ ئەوەی سیخوڕیمان بەسەرەوە بکەن. هەندێک جار ئەو سیخوڕانە بەدزی ئێمەوە وەرەقەیان لە ژێر دۆشەکەکانماندا دەشاردەوە، کاتێک ژوورەکانیان دەپشکنی وەرەقەکانیان دەدۆزییەوە. من یەک مەتر دووجای ژوورەکەم بەردەکەوت، ئەشکەنجە و لێدانیش لەو ماوەیەی کە لە زیندان بووم با لەولاوە بووەستێ. تەنها چل کەس لە زیندانییەکان زیندانی سیاسی عەرەب بوون، ئەوانی تر هەمووی کوردبوون.

ڕۆژی سێ جار، لە حەوشەی زیندانەکەدا کۆیاندەکردینەوە و دەستیان دەکرد بەژماردنمان. سەعات دوای سەعات لە ماوەی ئەو ژماردنەدا دەبوو لەو بەر باران و پیسییەدا بمێنایەتەوە، هەندێک جار لە کاتی ژماردنەکەدا یەکێک کەم یان زیاد دەردەچوو، بۆیە سەر لەنوێ دەستیان دەکردەوە بەژماردنمان. ژمارەیەکی زۆر لە زیندانییەکان بەهۆی کەم خۆراکیی و نەخۆشییەوە گیانیان لە دەست دا.

ئەو کەسەی کە دەرمانی دابەش دەکرد، ڤیتامینێکی دەداینێ پێیان دەوت (ABC)، دەیانووت ئەوە دەرمانی هەموو دەردێکە. ئێمە ئەو کابرایەمان ناو نابوو کاک (ABC). بۆمان نەبوو دوکتۆر ببینین.

قەشەیەکی کوردمان لەگەڵدا بوو، ڕیشێکی درێژی ڕەشی بەردابووەوە و خاچێکی بریقەداری بەملدا هەڵواسیبوو. بەلامانەوە جوان نەبوو لەگەڵمان بەشداری بکات لە پاککردنەوەی ئاودەستخانەکاندا. بەو ١٢٥٠ کەسە سێ ئاودەستمان هەبوو. دەبوو ڕیز ببەستین بۆ چوونە تەوالێت. بۆمان نەبوو ڕیزەکە تێک بدەین هەربۆیە هەندێک جار لە ڕیزەکەدا ڕووداو دەقەوما.

**عەبدوولوەهاب محەمەد عەلی ئاغای ڕەواندزی**

ناوم عەبدولوەهابە و تەمەنم پەنجا و چوار ساڵە و باوکی حەوت منداڵم. پیشەم وەرزێرییە. باوکم تەمەنی هەشتا ساڵە، وەختێ خۆی لە سەردەمی

نووری سەعیددا ئەندامی پەرلەمان بووە و سەرۆکی شارەوانی ڕەواندزیش بووە. هەروەها باوکم ڕاوێژکار بووە لە کۆمیتەی کۆمیسیۆنی مووسڵدا کە کابرایەکی سویدی بەناوی ئاف ویسرین، سەرۆکی بووە، تا ئێستاش ناوی ئەو پیاوەی لە بیر ماوە. لە هەموو سەرهەڵدانەکانی کورد دا لە دوای ساڵی ۱۹٤۳ وە بەشداریم کردووە. ساڵی ۱۹٤٥ لە ئێران بووم و تووشی نەخۆشیی پاراتیفۆس هاتم، بۆیە ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ عێراق. کاتێک دەیانبردمەوە بۆ ڕەواندز لەلایەن پاسەوانەکانی سەر سنوورەوە گیرام. ئەوان سوزی ئەوەیان دامێ کە چارەسەریم بۆ بکرێت پێش ئەوەی بمبەن بۆ لێکۆڵینەوە و دادگایی کردن، بەڵام درۆیان لەگەڵ کردم و ڕەچاوی نەخۆشیەکەیان نەکردم، بەڵکو بەقەرەوێڵەیەکی ئاسنینەوە بەستمیانەوە.

جارێکیان برسیم بوو داوی خواردنم کرد لە وەڵامدا وتیان: "کوڕی سەگ، بەدژمان ڕادەپەڕیت و دەتەوێت خواردنەکەشمان بخۆی".

لە ماوەی حەڤدە ڕۆژدا، دەست و قاچیان بەزنجیرێک بەقەرەوێڵەیەکەوە شەتەک دا، هەتا ئەو کاتەی بردمیان بۆ زیندانێک کە شەش ساڵم تیا بەسەربرد. بێ ئەوەی مەحکەمەم بکەن، حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ دەرکردم. سێ ساڵ و دە مانگ لە چاوەڕێکردنی جێبەجێکردنی حوکمەکەمدا بووم، ئەو ماوەیە زنجیرێکیان لە دەست و قاچم کردبوو کە کێشەکەی چواردە کیلۆ بوو. ئەو وێنەیەی کە دەیبینیت هی ئەو سەردەمەیە.

دوای ئەو ماوەیە، حوکمەکەیان کرد بەهەتا هەتایی و زنجیرەکەشیان بۆ گۆڕیم بەزنجیرێک کە کێشەکەی دوو کیلۆ بوو.

دەبوو بەو زنجیرەوە کار بکەم. دەبوو هەمیشە بەرتیل بدەم بەپاسەوانەکان تا خواردن و پێداویستییەکانی ترم بدەنێ. لە ۱۹٥۳/٦/۱۲دا بەکەفالەت ئازادکرام. ساڵی ۱۹٥٤، پێشنیازیان پێکردم کە خۆم هەڵبژێرم بۆ پەرلەمان، بەڵام من قبووڵم نەکرد. ئەوە بوو

خەڵکی ڕەواندز داوایان لێکردم کە پێشنیازەکە قبووڵ بکەم. لەو کاتەدا فەرمانیان پێدام کە دەبێت بچم بۆ بەغدا بۆ بینینی وەزیری ناوخۆی عێراق سەعید قەزاز، کە یەکێک بوو لە وەزیرە کوردەکان، ئەوەش بووە بەربەستێک لەوەی کە خۆم کاندید بکەم. سەعید قەزاز زۆر بەڕێزەوە پێشوازیی لێکردم. ئەوەی بۆ ڕوون کردمەوە کە ئەو پەیانەی حکومەتی عێراق داویەتی لەمەڕ هەڵبژاردنی ئازاد تەنها لەسەر کاغەزە و ئەوەی کە بەچ جۆرێک جێبەجێ دەکرێت مەسەلەیەکی ترە. لە ڕاستیدا ڕژێم پێش هەڵبژاردنەکە دەستنیشانی ئەوەیان کردبوو کە کێ هەڵدەبژێردرێت بۆ پەرلەمان. لە ناو ئەوانەدا دوو کەس هەبوون لە ناوچەکەی ئێمە، کە خەڵک دەنگی پێ نەدابوون، بەڵام دیسانیش هەر هەڵبژێردران. قەزاز پێی وتم کە من پیاوێکی بەتوانام و دەبێت زۆر بەوریاییەوە لەگەڵ مەسەلەکاندا هەڵسوکەوت بکەم. ئەگەر بتوانم هەوڵ بدەم سۆزی ڕژێم بەلای خۆمدا ڕابکێشم. لە ماوەی دە ساڵی نێوان ١٩٥٣-١٩٦٤، ئەمویرا لە هیچ چالاکییەکی سیاسیدا بەشداری بکەم. هەمیشە هەڕەشەی کوشتن و زیندانی کردنم لەسەر بوو. ئێستاش وەکو ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبەر لە ناو شۆڕشدا کار دەکەم.

**صابیر رەشید ئاکرەیی**

ناوم سابیر ڕەشید ئاکرەیییە و تەمەنم ٢٦ ساڵە و هێشتا ژنم نەهێناوە. لە ١٩٦١/١٢/١١، بەهۆی ئەوەی کە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بووم، گیرام. ماوەی نۆ ڕۆژ خستمیانە ژێر ئەشکەنجەوە. ڕۆژی دەیەم بردمیان بۆ بەردەم ئەو کۆمیتەیەی کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردم. جگەرەیەک و پیپسی کۆلایەکیان بۆ هێنام. کابرای لێکۆڵەرەوە داوای لێکردم کە بەبێ ئەملا و ئەولا، ئیعتراف بکەم. ئەوان دەیانزانی کە ئەندامی پارتیم، بۆیە هیچ شتێکی تازەم نەبوو کە پێیان بڵێم. هەتا توانیان بەقتوی کۆلاکە لێیان دام. پاشان بردمیان بۆ زیندانی مەرکەزی لە

مووسڵ. ماوەی دوو ساڵ بەبێ مەحکەمە لەوێ هێشتیانمەوە.

هەر پێنج ڕۆژ جارێک دوو پارچە سابوونیان دەداینێ. هەموو جارێکیش کە سابوونیان دابەش دەکرد، دەستیان دەکرد بەتێهەڵدانمان. ئێمەش نارەزایەتیمان دەردەبڕی و سابوونەکانمان بۆ فڕێ دەدانەوە.

لەگەڵ بیست کەسی تر گواسترامەوە بۆ ژوورێکی تر. لەوێش دەستیان دەکرد بەفەلاقەکردنمان لە بنی پێمانەوە هەتا خەڵتانی خوێنیان دەکردین. دوای ئەوە بەقاچی خوێناویەوە ناچاریان دەکردین کە دەست بەڕاکردن بکەین. ئەوانەی نەیاندەتوانی ڕابکەن دیسان دەکەوتنەوە بەر تێهەڵدان.

سێ مانگ کردمیانە ژوورێکی چوار مەترییەوە. لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی کە لە زیندانی مووسڵ بووم، ئەشکەنجەیەکی زۆریان کردم. دوای زیندانی مووسڵ بردمیان بۆ بەسرە و لەوێش شەش مانگ هێشتمیانەوە.

لە کاتی گفتوگۆی شۆڕش و حکوومەت لە ساڵی ١٩٦٤دا ئازاد کرام. دوای ئەوەی کە بەو دەردەیان بردم، هیچ ڕێگایەکی ترم لەبەردەمدا نەبوو جگە لەوەی پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکەم.

**سەبری ئەحمەد بۆتانی**

ناوم سەبری بۆتانییە و، تەمەنم ٤١ ساڵە وباوکی حەوت کوڕم، پێشتر لە هێڵی شەمەندەفەری عێراقی کرێکار بووم. لە ٢٥ تشرینی دووەمی ١٩٦٥دا بەهۆی هاوکاریکردنم لەگەڵ شۆڕشدا، گیرام.

دوای ئەوە بردیانم بۆ ناوەندی لێکۆڵینەوە کە لەلایەن محەممەد جەوادەوە سەرپەرشتی دەکرا. جێگرەکەی ناوی ملازم محەممەد بوو. لە ژوورەکەیاندا چەندەها ئامێری ئەشکەنجەدانی لێ بوو، لە پەتەوە بگرە هەتا دەگاتە قامچی و فەلاقە و بۆڕی پلاستیک، کە کردبوویان بەناو کورسیەکدا. هەروەها چەک و تەقەمەنیشی لێ بوو. ملازم محەممەد داوای لێکردم کە دەستم ئاولا بکەم و پەنجەکانم بلاوبکەمەوە. سێ فیشەکی خستە بەینی

پەنجەکانەوە، سەربازێکی بازو ئەستووری بەهێز کە لە پەنای کورسیەکەدا وەستابوو، هەتا توانی پەنجەکانی گوشی. ئەوان هەموو شتێکیان لەسەر من دەزانی، تەنها بۆ خۆشی خۆیان ئەشکەنجەیان دەدام. هەموو ڕۆژێک لە سەعات هەشتی بەیانییەوە هەتا نیوە شەو ئەوە کاریان بوو.

لەسەر پشت لەسەر زەویەکە ڕایان دەکێشام. سەربازێک لەسەر شانی چەپ و یەکێکی تر لەسەر شانی ڕاستم دادەنیشتن. یەکێکی تر قاچی دەخستە سەر دەمم. چوارەم قاچەکانی بەرز دەکردەوە و پێنجەمیش دەکەوتە لێدانی بەری پێکانم هەتا خوێنیان لێدەهات. لە ماوەی دوو مانگدا نەمدەتوانی لەسەر پێکانم خۆم بگرم. بەگاگۆڵکێ دەچووم بۆ سەر ئاو. ماوەی شەش مانگ لە زیندانی کەرکووک هێشتمیانەوە پاشان بەرەو مووسڵ، تا ببەن بۆ ژێر چاودێری مەحکەمەی سەربازیی.

لە کاتی گواستنەوەکەدا، لە چاوتروکانێکدا هەلێکم بۆ هەڵکەوت ڕابکەم و یەکسەر پەیوەندیم کرد بەهێزەکانی شۆڕشەوە. لەماوەی ئەو شەش مانگەی کە لە کەرکووک هێشتمیانەوە، حەوت سەد زیندانیی تر لە زیندانی کەرکووک گیرابوون.

**عەبدولجەلیل ڕەزا**

ناوم عەبدولجەلیل ڕەزایە و تەمەنم ٢٥ ساڵە و، ژنم نەهێناوە. پێشتر لە شەریکەیەکی شەخسی کارم دەکرد. گەلێک جار لەلایەن ڕژێمەوە گیراوم. ساڵی ١٩٥٦، ١٩٦١، ١٩٦٢ و ١٩٦٣، دوا جار کە لە ١٩٦٣/٦/١٠ دا گرتیانم، بردمیان بۆ زیندانی بەغدا. لەلایەن کۆمیتەیەکەوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ دەکرا بەسەرپەرشتیاری عەمار ئەلواش. هەر لە سەرەتاوە دەستیان لە پشتەوە بەستمەوە و کەوتنە لێدانم. دوای ئەوە بەپانکەیەکەوە هەڵیانواسیم. هێندەیان خولاندمەوە تا لە هۆش خۆم چووم. دایانبەزاندم، تا جارێکی تریش هەڵمواسنەوە، ئەمجارەیان قاچمیان بەپانکەکەوە بەستەوە، بەڵام نەیانخولاندمەوە، بەڵکو کەوتنە پرسیارکردن

دەربارەی ڕێکخراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. بەقامچیەک بەربوونە ویژەم. دیسان لە هۆش خۆم چوومەوە، بەڵام بەناوی سارد بەخەبەریان هێنامەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بن لە پرسیار و لێپرسینەوەکەیان.

پێش ئەوەی ڕەوانەی زیندانی شاری حللەم بکەن، سێ جار لێپرسینەوەیان لەگەڵ کردم، هەموو جارێکیش لێدان و ئەشکەنجە دووبارە دەبوونەوە. هەشت مانگ و نیو لە زیندانی حللە هێشتمیانەوە. ئەوە بوو بەهۆی گفتوگۆی شۆڕش و حکومەتەوە لە ١٩٦٤/٢/٢٤دا ئازادیان کردم. ئێمە لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە بەدیل گیرابوون، ئاڵوگۆڕمان پێ کرا. زیندانی بەغدا ناوەندی لێپرسینەوە بوو. لەوێ دە زیندانی سیاسی کوردم بینی کە دووچاری هەمان ئەشکەنجە و لێدانی بووبوونەوە.

ئێستا لە ڕادیۆی دەنگی کوردستان کار دەکەم.

**مستەفا موراد**

ناوم مستەفا مورادە، تەمەنم ٢٦ ساڵە و هێشتا ژنم نەهێناوە، پێشتر حەرەسی ڕێگاوبان بووم. لە ١٩٦١/١٠/١٢دا گیرام بەهۆی ئەوەی کە ئەندامی پارتی بووم. لە سەرەتادا لە ڕەواندز زیندانی بووم، پاشان بردیانم بۆ هەولێر. بەدرەدین عەلی کە بۆ خۆی کوێخای هەولێر بوو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردم. لەسەر زەوی ڕایکێشام و بەشەق بەربووە دەم و چاوم، بەشێوەیەک بڕۆم درزی برد.

ماوەی سێ مانگ لە هەولێر زیندانی بووم، پاشان ڕەوانەی زیندانی مووسڵیان کردم و کردمیانە ژوورێکی تاکە کەسییەوە، کە ئیتر هیچ پەیوەندیەکم بەدنیای دەرەوە نەما.

ساڵی ١٩٦٣ بەدزییەوە ژمارەیەک ڕۆژنامەی خەباتیان گەیاندبووە ناو زیندانییەکان و ئەم دەست و ئەو دەستی پێدەکرا، ئەمەش بووە بەهانەیەک

بۆ بەڕێوەبەرایەتی زیندان کە شەست وپێنج زیندانی کورد فەلاقە بکەن.

لە زینداندا هێشتمیانەوە هەتا لە یەکی کانوونی دووەمی ١٩٦٦ دا، دوای پێنج ساڵ ئازار و ئەشکەنجە لە زیندانە جۆراوجۆرەکانی عێراقدا، ئازاد کرام. پێنج ساڵ تەمەنی خۆمم بەبێ مەحکەمە لە زیندانەکانی عێراقدا بەسەر برد. ژیانی ناو چیاکانی کوردستان، لە ژیانی ناو زیندانەکانی ڕەواندز و هەولێر و بەسرە و ڕومادی، خراپتر نییە.

**سەیدا ساڵح یوسفی**

ناوم ساڵح یووسفییە، تەمەنم پەنجا ساڵە و سیاسیم. لە ١٩٦٣/١/١ دا، نێردرام بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕژێمی عێراقی. من جێگری سەرۆکی وەفدی کوردی بووم، ناجی تالیب سەرۆک وەزیرانی ئێستای عێراق، کەسی سەرەکی وەفدی عێراقی بوو. ئەوە بوو گفتوگۆکانمان سەری نەگرت و هیچ پەیمانێکمان مۆر نەکرد. سەرەڕای سەرنەگرتنی دانیشتنەکانمان، وەکو نیاز پاکی من لە بەغدا مامەوە تا بەڵکو درێژە بەدانیشتنەکان بدەین و بەردەوام بین. لەگەڵ ئەوەی کە من لەلایەن سەرکۆماری ئەو کاتە، عەبدولسەلام عارف، بانگێشت کرابووم، کەچی لە دوای گفتوگۆکان دەستگیرکرام، لە ماوەی ١٩٦٣/٦/٦ تا ١٩٦٤/١/٣، زیندانی کرام.

لە کاتی لێپرسینەوەدا، هەردوو دەستیان بەستمەوە و بەپانکەیەکی گەورەدا هەڵیانواسیم و خولاندمیانەوە هەتا بێ هۆش بووم. پالیان دام بەدیوارێکە و بەدەمانچە کەوتنە تەقەکردن و پێیان وتم: دڵنیابە کە جاری داهاتوو دەتپێکین. جگەرەیان لەسەر لەشم دەکوژاندەوە. هەموو ئەم ئەشکەنجانە بەچاودێری عەمار ئەلواش دەکرا. ئەو کەسەی کە ئەشکەنجەی دەدام جێگرەکەی ئەلواش بوو بەناوی ناظم گزار.

لە دوای ئەوەی کە ئازادکرام، وەکو بەرپرسی ڕادیۆی دەنگی کوردستان کاردەکەم.

ناوم عەلی عەزیزە، تەمەنم ۲۳ ساڵە، سایەق و قاچاخچیم. ساڵی ۱۹٦۲ گیرام، چونکە پێناسەم پێ نەبوو. سێ ڕۆژ لە پۆلیسخانە هێشتمیانەوە، پاشان ناردمیان بۆ لێپرسینەوەی سەربازیی. لەوێ کەوتنە پرسیارلێکردنم دەربارەی ئەوەی کە ئاخۆ ئەندامی پارتیم یان شیوعی. پێیان وتم دەبێت قسە بەخروشۆف و ژەنەراڵ بارزانی بڵێم. منیش دەمویست تێیان بگەیەنم کە من کوردێکی ئاساییم و نامەوێت خۆم تێکەڵ بەکاروباری ئەو پیاوانە بکەم.

دوای ئەوە ڕەوانەی زیندانی بەغدایان کردم و چواردە ڕۆژ هێشتمیانەوە، دوای ئەوەش تەسلیمی پۆلیسی نهێنی بەغدایان کردم. ئەوانیش بەهەمان شێوە دەیانویست بزانن کە ئاخۆ کۆمۆنیستم یان سەر بەبارزانیم.

ئەگەر بەدژی بارزانی قسەم بکردایە ئەوا ئەو کاتە تاوانباریان دەکردم بەوەی کە سەر بەکۆمۆنیستەکانم، خۆ ئەگەر قسەشم بەخروشۆف بدایە ئەوکاتە دەیانوت تۆ سەر بەبارزانیت. منیش ڕازی نەبووم قسە بەکەسیان بڵێم، پێم وتن کە من کوردێکی ئاساییم و هیچ پەیوەندییەکم بەو سەرۆکانەوە نییە.

ئەو کەسەی کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردم، پرسیاری ئەوەی لێدەکرم کە ئایا کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم دڵخۆشی کردم یان نا؟ منیش هەر وەک پێشوو وتم من کوردێکی ئاساییم و هەقم بەسیاسەتەوە نییە.

کابرا بەوەڵامەکانم دڕدۆنگ بوو. هەردوو قاچیان بەپانکەیەکەوە بەستمەوە و دەستیان کرد بەخولانەوەم هەتا بێ هۆش بووم. ناوی ئەوانەم لە بیر نەماوە کە ئەشکەنجەیان دەدام. ئەو ماوەیەی کە لە بەغدا هێشتمیانەوە، بەبەردەوامی ئەشکەنجە و پرسیارکردنەکان دووبارە دەبوونەوە.

دوای ئەوەی کە عەبدولسەلام عارف، ژەنەراڵ قاسمی کوشت، وازیشیان لەمن هێنا و بەریان دام و هێنامیانەوە بۆ سلێمانی.

لە ١٩٦٣/٦/٩ ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی بەعسییەکان هێرش بکەنە سەر هێزی پێشمەرگە، دەستیان بەسەر لۆریەکەمدا گرت و دیسانەوە بردمیانەوە بۆ زیندان. هەر هەمان ڕۆژ، چەند هەزار کوردێکیان لە شاری سلێمانی گرت و لە قاوشە سەربازیەکانیان توند کردن، چونکە زیندانەکان پڕ بووبوون. نزیکەی ١٤٠٠ کەس لەو قاوشەدا بوو کە منی لێ بووم. ماوەی چواردە ڕۆژ لەو شوێنە تەنگەدا هێشتیانینەوە. چوار ڕۆژی یەکەم هیچ خواردنێکیان نەداینێ. لە ناوگیراوەکاندا، خەڵکانی پایەبڵندی کارمەندی میریش هەبوون. لەوێ دوو دوکتۆرم ناسی بەناوی جەمال ڕەشید و فایەق هوشیار.

هەر شەوە و چەند کەسێکیان لە زیندانییەکان دەبرد و نەیاندەگێڕانەوە. دوایی بیستمان کە دوو سەد و شەست کەسیان ڕەمی کردبوو، هەموویانیان بەکۆمەڵ ناشتبوو. ئێستا ئەو شوێنە بەگۆڕی شەهیدان ناو دەبرێت.

لە ماوەی دە ڕۆژدا لە لایەن سوپاوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ کرا و، داوایان لێدەکردم کە قسە بەشۆڕشی کورد بدەم، بەڵام من نە چوومە ژێر باریان. ئەوانیش بەردەبوونە ویژەم هەتا لە هۆش خۆم دەچووم. کاتێک کە بەهۆش هاتمەوە، جلەکانم لە خوێن و ئاودا خوسابوون، بەئاوی سارد بەهۆش خۆمیان دەهێنامەوە. زابتێک بەناوی کازم عەبدولڕەزاق جگەرەیەکی دامێ و داوای لێکردم کە جنێو بەژەنەراڵ بارزانی بدەم. منیش لە وەڵامدا وتم "ناوێرم قسە بەبارزانی بڵێم، لە ترسی ئەوەی کاتێک کە ئازاد بم، هەقم لێدەکەنەوە". دوای بیست ڕۆژ ئازادیان کردم. لەو ماوەیەدا کە لە زیندان بووم، تووشی نەخۆشیی برینی گەدە بووم.

بۆ جاری سێیەم، لە پایزی ١٩٦٣دا لە شاری بەعقوبە گیرامەوە. دەستیان کرد بەپرسیار لێکردنم کە ئاخۆ هیچ پەیوەندییەکم بەسوپاکەی

ژەنەراڵ بارزانییەوە هەیە یان نا. منیش پێم وتن، نەخێر. ئەوە بوو پشتیان لە ئوتوو دام. بەئەنقەست سێ جار ئوتوەکەیان بەهەمان شوێندا هێنا، بەشێوەیەک کە جاری سێیەم لەهۆش خۆم چووم. دیسان بردمیانەوە بۆ تەحقیق، هەمان تاس و هەمان حەمام، هەمان پرسیاریان لێکردم، منیش هەمان وەڵامی جارانم دانەوە.

ئەو کەسەی کە تەحقیقی لەگەڵ دەکردم بەسەر نیشارەتی بۆ کەسێکی تر کرد، ئەویش مقاشێکی سێ چوکڵەی لەسەر پەرەمێزێک دانا، چاوم لێبوو کە چۆن مقاشەکە سوور بووبووەوە، پاشان کابرا مقاشەکەی نا بەپشتمەوە. هەستم دەکرد و گوێم لە قرچەی پشتم بوو، بۆنی گۆشتی سووتاوی خۆمم دەکرد، کە بەدیار چاوی کابرای لێکۆڵەرەوە هەڵدەپروسکا. جێگای مقاشەکە کە تا ئێستاش بەپشتمەوە دیارە، بەڵگەیەکە بۆ ئەو کارەساتەی کە بەسەریان هێنام.

دوای ئەوە تەحقیقێکی کەمی تریان لەگەڵ کردم و بەپشتی سووتاوەوە، ئازادیان کردم. لۆریەکە کە هی من و هاوڕێیەکەم بوو، لەلایەن حکومەتەوە دەستی بەسەردا گیرا. پارەکەیان لە دەمم فڕاندم. بۆیە هیچ چارەیەکی ترم نەما جگە لەوەی کە پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکەم.

**عەبدولڕەحمان قازی**

تەمەنم پەنجا و پێنج ساڵە و باوکی چوار منداڵم. پێشتر لە ناو سوپای عێراقدا زەعیم بووم. لە ساڵی ١٩٦٣دا بەتۆمەتی ئەوەی کە دژی هەوڵدانی کودەتاکەی شەواف بووم کە لە ساڵی ١٩٥٩ پێی هەستا، دەستگیرکرام. لەو کاتەدا من لەهەولێر بەرپرسی هێزی تۆپخانەی شەش بووم. وەکو سەربازێکی گوێڕایەڵ لە ناو سوپای عێراقدا، ئامادەبووم بەدژی کودەتاکەی شەواف بجەنگم. بەڵام پێویستی بەوە نەبوو کە ئێمە هیچ بەربەرچێکی بدەینەوە، چونکە ئەو پاش یاخیبوونەکەی بەماوەیەکی کەم لەلایەن قاسمەوە کوژرا. لە ڕاستیدا، ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو کە

منی پێ تاوانبار بکەن، بەڵام شەواف لەلایەن عەبدولسەلام عارفەوە وەکو شەهید لەقەڵەم درا. ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەو لە شەڕی دوژمنێکی هاوبەشیاندا کوژرابوو، کە دیکتاتۆری پێشوو قاسم بوو.

یەکەم جار بەوە دەستیان پێکرد کە ناچارم بکەن واز لە وەزیفەکەم بهێنم، لە ١٩٦٢/١/١٥. ئەوکاتە تازەیەک گەنج بووم. پاشان بەتۆمەتی شتێک منیان دەستگیر کرد، کە هیچ بەرپرسیاریەکم تێیدا نەبوو. لە ژوورێکی تاریکی چوار مەتریدا زیندانیان کردم. لەگەڵ هەشتا و سێ کەسی تردا زیندانی کرابووم کە هەمویان کورد بوون، لە هەموو چین وتوێژێکیان تێدابوو.

ئەفسەری بڵند پایەمان تێدابوو، کە هەر بەجلە سەربازییەکانیەوە گیرابوو، لەلایەن سەربازی ئاسایی و ئەفسەرە پلە نزمەکانی ترەوە سووکایەتیان پێدەکرا و ئەشکەنجە دەدران. هەموو لە یەک سەتڵدا نانمان دەخواردەوە. نەمان دەتوانی ڕابکشێین، بەڵکو بەنۆرە دادەنیشتین. ئێمەیان لە ژوورێکدا ترانجاندبوو، دەبوو هەندێکمان بەپێوە و هەندێکی تر بەنۆرە دانیشتینایە. کۆمەڵێک ئەفسەر دەهاتن بۆ سەردانمان و بەڕاست و چەپدا دەکەوتنە لێدانمان. هەندێک لەوانە پێشتر فەرمانیان لە ئێمە وەردەگرت. هەندێک جار بەتەنها دەیانبردین بۆ لێکۆڵینەوە، هەندێک جاریش چەند کەسێک بەیەکەوە. کابرای کە تەحقیقی لەگەڵ دەکردین ناوی تەها حەمدوون بوو. مولازم نزار و موخلف عەزیز جێگری بوون. بەرپرسی زیندانەکەش ڕەشید هەمزە سەباح بوو. چەند جارێک لە گەڵ خەڵکانی ناسراوی وەکو دوکتۆر سالم، ئەفسەر موتح عەبدولحسێن، مولازم عەبدولقادر، ئەفسەر جەعفەر غەزل، مایۆر یەحیا نادر و مولازم سمکۆ مەجید، بەیەکەوە ئەشکەنجەیان دەداین. یەحیا نادر لە زینداندا کۆچی دوایی کرد.

بە مستەکۆڵە و بەقامچی دەکەوتنە گیانمان، دەستیان دەبەستینەوە و بەپانکەوە هەڵیاندەواسین و دەیانخولاندینەوە تا بێهۆش دەبووین. لێیان

دەپرسیم کە ئاخۆ پەیوەندیم لەگەڵ شیوعیەکان هەیە، وەڵامی منیش نەخێر بوو. دەیانوت کە بۆچی لە ساڵی ١٩٥٩دا پشتیوانیم لە شەواف نەکرد. منیش دەموت من دڵسۆزی حکومەت و سوپای عێراقی بووم و نەمدەویست پەیوەندی بەکودەتاچییەکانەوە بکەم. بەڵام ئەوان بەو وەڵامانە قایل نەدەبوون.

زیاتر لە پازدە جار خستمیانە ژێر ئەشکەنجەی سەختەوە. دوو جار بەپانکەوە هەڵیانواسیم هەر جارەی بۆ ماوەی بیست دەقە دەیانخولاندمەوە تا بێهۆش دەبووم. یەکێک لەوانەی کە لەگەڵ من زیندانی کرابوو، زیاتر لە بیست دەقە دەیانخولاندەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە بۆ ماوەی چوار مانگ دەستەکانی ئیفلیج بن. ئەو کەسەش ناوی خالید دەرویش بوو.

یەکێکی تر لە زیندانییەکان ناوی نووری بوو، ئەشکەنجەدەرەکان، بتڵیان تێبڕی، سەری بتڵەکەیان چەور دەکرد تا بەئاسانتر بچێتەوە ناودوە، بۆ ئەوەی زۆرترین ئازار بچێژێت. لە ١٩٦٣/٦/٣ لە مەعەسکەر ڕەشید، هەوڵی ڕاپەڕینێک درا، بەڵام هەر زوو سەرکوت کرا. ئێوارەی هەمان ڕۆژ ئێمەیان بەقۆڵ بەستراوی برد بۆ مەحەتەی شەمەندەفەر. کاتژمێری دووی شەو بوو، خستیانینە ناو فارغۆنێکی بارهەڵگرەوە. من لەگەڵ سی و سێ کەسی تر خرامە ناو فارغۆنێکی قەپاتکراوەوە. ناوەوەی فارغۆنەکە بەچیمەنتۆ سواخ درابوو، هەموو کون و قوژبنێکیان ئاخنی بوو کە هەوای لێ دەهاتە ژوورەوە. سەرۆکی سوپای عێراق کە هەمان کات سەرۆکوەزیرانیش بوو، لەگەڵ جەنەراڵ تەها یەحیا و ڕەشید مسولحی سەرۆکی سوپا، بەرپرسی هێڵی شەمەندەفەری عێراق، زیادنەلقاوی، فارغۆنەکان و ئێمەشیان پشکنی، پێش ئەوەی بەرەو شاری سەماوە کە دەکەوێتە نێوان بەغدا و بەسرەوە، بکەوێتە ڕێگا.

هەموومان دەستمان بەسترابووەوە. لەو ماوەیەی کە لە ڕێگادا بووین، نە نان و نە ئاویان پێ نەداین، نەیاندەهێشت پێویستییەکانمان جێبەجێ بکەین.

بە دوای ئەو چەند سەعاتەی گزەبای سەر لە بەیانی، گەرمای بەتینی خۆری عێراق، فارغۆنەکانی گەرم کرد. یەکێک لە گیراوەکان مرد. ئێمەش بەنیوە مردوویی و بووراوەیی گەیشتینە سەماوە. دەرگای فارغۆنەکان کرانەوە. شۆفێری شەمەندەفەرەکە دوو سەعات زووتر ئێمەی لە کاتی خۆی گەیاندە جێگا، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو بەرنامەیەی کە بۆی دانرابوو. زۆربەمان لەو باوەڕەدابووین کە ئەو سایەقە گیانی زۆربەمانی لە مردن ڕزگار کردبوو. لە دواییدا بیستمان کە شۆفێرەکە بەپێنج ساڵ زیندانی حوکم درابوو، بەتاوانی لە فەرمان لادان.

دوای ئەوە بردیانین بۆ زیندانی نوگرە سەلمان، کە ١٨٠ کیلۆمەتر لەو شوێنەوە دوور بوو. نوگرە سەلمان کاتی خۆی لەلایەن کابرایەکی ئینگلیزی بەناوبانگ، گلوب پاشاوە دروست کرابوو.

پێنج ڕۆژ دوای ئەوەی کە ئازاد کرام، پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد.

لە کاتی هێرش کردنە سەر چیای هەندرێن لە بەهاری ١٩٦٦، بەفەرمانی سەرۆکی سوپا، ژنە نەخۆش و منداڵەکانیان خستبووە پێش سەربازەکانەوە، ئەو کاتە من بەرپرسی تۆپخانە بووم، ئەوان حسابی ئەوەیان کردبوو، کاتێک خەبەری ئەوەم پێ بگات کە منداڵەکانم خراونەتە پێش سەربازەکانەوە، ئیتر تۆپبارانیان ناکەم. جاشێک بەدژی ئەو کردەوەیە ناڕەزایەتی نیشان دابوو. پارێزگاری هەولێر کە هاوڕێیەکی نزیکی خۆم بوو، بەهۆی ئەو ناڕەزایەتییەوە منداڵەکانمی لە بەرەی شەڕ دوورخستبووەوە.

**شێخ ڕەزا شێخ محەممەدی بەرزنجی**

تەمەنم چل ساڵە، پێشتر لە پۆلیسی نهێنی عێراقدا کارم دەکرد. لە ساڵی ١٩٥١ دا لە شاری بەغدا، کۆلیجی پۆلیسم تەواو کرد. ماوەی هەشت ساڵ لە ناو پۆلیسدا کارم کرد. چەندین جار لەگەڵ زیندانییە سیاسیەکاندا

لێکۆڵینەوەم کردووە. یان باشتر بڵێم ئەو کەسانەی کە بوونە قوربانی سیاسەتی ئەوانەی کە عێراقیان بەڕێوە دەبرد.

نزیکەی دوای ساڵێک لە کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم، دەسەڵاتداران بەشێوەیەکی بەربڵاو دەستیان کرد بەگرتن و ئەشکەنجەدانی خەڵک. لە ساڵی ۱۹٦۱ دا منیشیان بەتاوانی ئەوەی کە دەستم لەگەڵ پێشمەرگەدا هەیە، گرت. بەبێ مەحکەمە هەتا ساڵی ۱۹٦۲ هێشتمیانەوە.

ساڵی ۱۹٦۲، ماوەیەکی کەم پێش بەربوونەکەم، ڕەوانەی زیندانی فەدیلیان کردم لە بەغدا کە سێ سەد و سی زیندانی سیاسی تریشی لێ بوو. ڕۆژانە پارەیەکی کەمیان پێدەداین. سێ لە زیندانیەکان، عەبدوڵلا چۆلی بارزانی، حاجی سلێمان ئاکرەیی و ڕەشید خانەقینی لە ژێر ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوەدا گیانیان سپارد. کاپتن عەبدولڕەزاق بەرپرسی لێکۆڵینەوەی ئەو بەشەی ئێمە بوو. ئەو ئەم جۆرە ئەشکەنجانەی بەکاردەهێنا: لە پشتەوە هەواکردنە ناو لە شەوە، هەڵواسین بەپانکەوە بەدەستی بەستراوەوە، قامچی لێدان، ئاوی ساردیان دەکرد بەزیندانییەکاندا و پاشان پانکەیان بۆ هەڵدەکردن، دەست بەستنەوە و کەلەپچکە کردن بەتوندی. لەو باوەڕەدام کە نزیکەی هەزار کوردێک لە ژێر ئەو جۆرە ئەشکەنجانەدا گیانیان لە دەستداوە.

دوای ئەوەی کە بەعسییەکان لەسەر کار لابران، کتێبێک لە ژێر ناوی (ئەلمونحەرفین)، لە شاری بەغدا لە چاپ درا و بڵاوکرایەوە. کتێبەکە بەزمانی عەرەبی بوو. دوایی لە سەردەمی سەرکۆماریی عەبدولسەلام کە سەرۆکی سەردەمی بەعسییەکان بوو، قەدەغە کرا. ئەو کتێبە دیکۆمێنتێکی ڕەسمی بوو کە باسی جۆرەکانی ئەشکەنجەی لە عێراقدا دەکرد.

**ئەحمەد حوسێن لەفقاسی**

ناوم ئەحمەد حوسێن قەفقاسییە و تەمەنم هەشتا ساڵە. کۆچەریم و پیشەم کڕین و فرۆشتنی مەڕ و ماڵاتە. خێزانەکەم لە خۆم و ژنەکەم و چوار کوڕ و

کوڕەزایەک و ژنی کوڕەکەم پێکهاتووە. ئێمە لەگەڵ چوار خێزانی تر، کە دەبینە سی و نۆ کەس، خێڵە و خوار و خێڵە و ژوور دەکەین. بژێوی ژیانمان بەفرۆشتنی ڕەشە وڵاخی لە جۆری گوێدرێژ و هێستر و ئەسپ، بەدەست دەخەین.

بە گشتی ئەو ئاژەڵانەی کە لەڕ و لاوازن دەکڕین، پاش ئەوەی قەڵەویان دەکەینەوە تا بەکەڵکی بارهێنان دێن، بەجوتیارەکانیان دەفرۆشینەوە.

ئەم کارەی ئێمە مێژوویەکی کۆنی هەیە و بەهەموو پارچەکانی کوردستاندا دەگەڕێین، حەیوانمان بەکورد و عەرەب و فارس و تورک فرۆشتووە. لەم ئەخیرانەدا، کە هێشتا نەکەوتبووینە بەر هێرشی فڕۆکەی عێراقییەکان، هەموو دار و نەدارمان، بیست و پێنج گوێدرێژ بوو.

ڕۆژێکیان لە ناوەڕاستی مانگی ئایاری ١٩٦٦ دا، لە ناکاو، کەوتینە بەر هێرشێکی توندی فڕۆکە عێراقییەکان. بۆمبێک لە ناوەڕاستی ڕەشماڵەکانماندا تەقییەوە، هەژدە لە گوێدرێژەکانمان پارچە پارچە بوون.

لە کاتی ئەو ڕووداوەدا، بیست و پێنج کەس لە ئەندامانی خێڵەکەمان لە ناو ڕەشماڵەکاندا بوون. یازدە کەس لە ناویاندا کوڕێکی خۆم هەرلەوێدا کوژران. چوار کەسیشیان بریندار بوون و ئێستا شەڕ لەگەڵ مردن دەکەن.

ئەم کارەساتە وایکرد کە بژێوی ژیانمان سەختتر بێت و ناچار بووین پەنا بۆ سوالکردن بەرین. ئێستا لێرە و لەوێ بەناو کوردە نیشتەجێکاندا دەگەڕێین و سوالیان لێ دەکەین.

دەوڵەتی تازە بنیاتنراوی عێراق، لە ولایەتەکانی مووسڵ و بەغدا و بەسرە پێکهاتووە، کە سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوون. ناوچەکانی سەرووی بەغدا بەکوردستان ناسراون، کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی کوردن. ناوچەکانی بەغدا و خواروی بەغدا بەمیسۆپۆتامیا ناسراون، مەبەست لەو ناوچانەیە کە دانیشتووانەکەی عەرەبن. بەماوەیەکی کەم پێش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان، هەردوو ناوچە عەرەبی و کوردییەکە لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکران.

لەکۆنفرانسی سیڤەر کە لە ساڵی ١٩٢٠دا بەسترا، شەریف پاشا، کۆنە سەفیری دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم، نوێنەرایەتی کوردی دەکرد. لەوێدا لە لایەن عوسمانی و هێزەکانی هاوپەیمانەوە دان نرا بەسەربەخۆیی کوردەکاندا، لەو ناوچانەی کە زۆرینە پێکدەهێنن.

لە کۆنفرانسی دوای ئەوە کە بەکۆنفرانسی لۆزان ناسراوە لە ساڵی ١٩٢٣، ناوی کوردستان نەهێنرا، بەڵام چارەنووسی ئەو ناوچەیە سپێردرا بەپەیمانی نێوان بەریتانیا و تورکیا، خۆ ئەگەر ئەو دوو لایەنەش نەیانتوانی لەسەر چارەنووسی ناوچەکە (کوردستان) پێکبێن، ئەوا کۆمەڵەی نەتەوەکان بانگهێشتی بکرێت بۆ یەکلاکردنەوەی.

دوای کشانەوەی هێزەکانی عوسمانی لە سعودیە، عێراق و سوریا، دوو لە کوڕەکانی شەریف حوسێن، بەیارمەتی بەریتانییەکان کران بەمەلیکی ناوچە عەرەبیەکانی عێراق و سوریا.

فەیسەڵی یەکەم کرا بەمەلیکی سوریا، بەڵام هەر کە بەریتانیەکان سوریایان بەجێ هێشت بۆ فەرەنسیەکان، فەیسەڵیش وازی لە مەلیکیەتی ئەو وڵاتە هێنا و چوو بۆ بەغدا بۆ ئەوەی خۆی بکات بەمەلیکی عێراق، کە ناوەندەکەی بەغدایە. ئەم هەڵوێستەی بەریتانیەکان لەلایەن کوردەوە

بەتوندی بەرپەرچ درایەوە، کورد داوای سەربەخۆییان دەکرد لە ناوچەکانی خۆیان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود.

بەریتانیەکان ڕازی بوون بەوەی کە شێخ مەحمود ببێت بەوالی ناوچەکانی کوردستان(باکووری عێراق)، بەڵام ئامانجی شێخ مەحمود ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بوو بەمەرجێک هاوتای ناوچە عەرەبییەکان بێت.

شەڕ لە نێوان کورد و هێزەکانی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی بەرپا بوو. لە شەڕی چارەنووسسازی دەربەندی بازیان لە ١٩١٩/٦/٩، شێخ مەحمود بەبریندار کەوتە دەستی هێزەکانی بەریتانی. دوای ئەوە شێخیان بەمەرگ حوکم دا، بەڵام حوکمەکەیان گۆڕی بەدورخستنەوەی شێخ مەحمود بۆ هیندستان. بەهۆی نارەزایی توندی کورد و مەترسی هەلگیرسانەوەی شەڕلە نێوان کورد و ئینگلیزەکان، لە ئەیلوولی ١٩٢٢دا شێخ مەحمودیان ئازاد کرد و هێنایانەوە بۆ شاری سلێمانی.

لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا شێخ مەحمود کرا بەپاشای کوردستان، بەڵام تەنها هەقی هەبوو لە ناوچەکانی سلێمانیدا حوکمڕانی بکات. بەریتانیەکان نەیاندەویست ناوچەکانی کەرکووک کە پڕبەتی لە نەوت، وەکو ناوچەی پالێوراوی سەربەخۆ لە ژێر دەسەلاتی کورددا بێت. دیسان کێشەی نێوان کورد و ئینگلیزەکان سەری هەلدایەوە. ئەوە بوو شاری سلێمانی لەلایەن هێزەکانی بەریتانییەوە ئابلوقەدرا و هەندێک جاریش فڕۆکەکانی بەریتانی شاریان بۆردومان دەکرد. شێخ مەحمود ناچار بوو لە ٤ی ئاداری ١٩٢٣دا شار بەجێ بهێڵێ. لە ٦/١١ی هەمان ساڵدا، شێخ گەڕایەوە بۆ ناو شار بۆ ئەوەی بەربەرەکانی هێزەکانی عەرەب و بەریتانیەکان بکات، بەڵام دیسان ناچارکرا پەنا بەرێتەوە بۆ شاخەکان.

بە گوێرەی پەیمانی لۆزان کە لە ١٩٢٣/٦/٢٤ بەسترابوو، دەبوایە کێشە سنوورییەکانی عێراق و تورکیای نوێ لە نێوان بەریتانیا و تورکیادا چارەسەر بکرێت. ماوەی نۆ مانگیان بۆ دانابوون بۆ دیاریکردنی

سنوورەکـان، بەڵام گـفـتـوگـۆکـانـیـان هیـچی لێ شین نەبوو. تورکـەکـان دەیانویست ئەوە بسەلمێنن کە لەنێوان کورد و تورکدا جیاوازی نییە، بۆیە ناوچەی مووسڵ دەبێت بکەوێتە ناو سنووری دەسەڵاتی کۆماری تورکیای نوێوە. پاش ئەوەی، کاتە دیاریکراوەکە تەواو بوو، کۆمیتـەیەکی تایبـەتی سەر بەکۆمەڵە نەتەوەکان، دیاری کرا. دیبلۆماتی سوێدی E. Af Wirsen، کرا بەسەرۆکی کۆمیتـەکە، کە لە سەرۆک وەزیرانی هەنگاری P. Teleki، ئەفسەری بەلجیکی P.A. aulis ، ئیتایەک G.Sinor Roddolo، ئەجیبزادەی ئەمساوی Horace de oyrtalès، پێکهاتبوو.

ناسنامـەی کورد لەلایەن کۆمیتـەی مووسڵەوە پێناسـەکرا لە کێشـەی (پرسـیـاری) سنووری نێـوان تورکـیـا و عـێـراق، (Leaue of nations,enèe : (1926, sid.46) "کـورد نە عـەرەب، نە تورک و نە فـارسن، بەڵام لەگـەڵ فـارسـەکـاندا نزیکایەتیـان هەیە. ئەوان و تورکـەکـان جـودان و هێـڵـێکی دیاریکراو لە نێــوان ئەوان و تورکـــەکــــاندا هەیە، لەوەش زیاتر لە عەرەبەکانەوە دوورترن.

لە لاپەرەی پەنجـا و حـەوتدا هاتووە " ئەگـەر رەچاوی ئەرگـومـێنتـە ئیـــتنیـکـیــــــەکــــان بکرایە، ئەوا دەبوو بەروون و ئاشکرایی رێگا بەدروســــتکردنی دەوڵەتێکی کــــوردی بدرایە، چونکە ئەوان ٥/٨ی دانیـشـتـوانیـان پێک دەهێنا. ئەگـەر چارەسـەریەکی وا بیـمژاراندرایە ئەوا ئێزدییـەکان کـە زۆر لە ئیـتنیـکی کـوردییەوە نزیکن(ئێـزدییـکان کـوردی ئەسڵن، ئەوە داگیرکەران و ناحەزانی کوردن کە دەیانەوێت ناکۆکی بخەنە نێوان ئەوان و کوردە موسڵمانەکانەوە-وەرگێڕ) و تورکەکانیش بەئاسانی لەنێـو کـوردانـدا دەتوانەوە، ئەوا ئەو کـاتە ئەوانیش دەخـرانە سـەر رێژەی کورد".

لە بەیاننامەیەکی هاوبەشدا لە بەغدا لە ٢٤ کانوونی یەکەمی ١٩٢٢دا، هەردووک لا، عـەرەبەکـان و بەریتـانیـیـەکـانیش دانیـان نا بەسـەربەخـۆیی

(بەڕێوەبردنی خۆجێیی) کوردەکاندا: «دەوڵەتی بەریتانیای گەورە و دەوڵەتی عێراق دان دەنێن بەمافەکانی گەلی کورددا لە چوارچێوەی سنوورەکانی عێراقدا و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەدا. ئەوان هیوادارن کە گروپە کوردییەکان بتوانن هەرچی زووترە لە نێو خۆیاندا ڕێک بکەون لەسەر جۆری ئەو ڕژێمەی کە خۆیان هەڵیدەبژێرن. پاشان وەفدێک بنێرن بۆ تاوتوێکردنی پەیوەندییە ئابووری و سیاسیەکانیان لەگەڵ ڕژێمی عێراقی و دەوڵەتی بەریتانیای مەزن».

لە پەیمانی ئەنگلۆعێراقیدا لە ساڵی ١٩٣٠ بەیەک وشەش باسی کورد و بوونیان لە ناو سنووری ئەو وڵاتەدا، نەکراوە، ئەمەش بووە هۆی نارەزایەتی کورد و ڕێگای بۆ سەرهەڵدانێکی تر کردەوە.

عەرەبەکان و بەریتانییەکان توانیان تەنها لە ڕێگای بۆردومانی هەواییەوە، شۆڕشی کورد خامۆش بکەن. هەروەها بەهەمان شێوە، شۆڕشی ساڵی ١٩٣٣ و ١٩٤٣ لە گرێژنە بردرا.

ساڵی ١٩٤٥ شۆڕشێکی نوێ لە ناوچەی بارزان سەری هەڵدا. جگە لە هێزەکانی حکوومەت، خێڵە کوردەکانی، کە نەیاری شۆڕشەکەیان دەکرد، ئەوانەیشی کە پەیوەندییان بەکوردەوە نەبوو، چەکدار کران. ئەفسەری عەرەب، عەبدولکەریم قاسم سەرکردایەتی دەکردن، کە پاشان بووە کودەتاچی و دیکتاتۆری عێراق. شۆڕشی ساڵی ١٩٤٥ و هەردوو شۆڕشەکەی پێشتر (١٩٣٣ و ١٩٤٣) لەلایەن ژەنەراڵ مستەفا بارزانییەوە سەرکردایەتی دەکرا. بەهۆی نەبوونی کەرەستەی پێویستی جەنگی و نارێکوپێکی ڕێکخراوەیی، شۆڕشەکان شکستیان خوارد.

لە ساڵی ١٩٤٥دا، مستەفا بارزانی بەخۆی و دە هەزار کەسەوە کە لەلایەنگرانی پێکدەهاتن، سێ هەزار لەوانە چەکدار بوون، ڕوو دەکاتە ئێران (ڕۆژهەڵاتی کوردستان) و دەداتە پاڵ قازیی محەممەد کە پاشان بووە سەرکۆماری مهاباد. لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهاندا، باکووری

ئێران لەلایەن ڕووسیا و باشووریشی لەلایەن بەریتانیاوە داگیر دەکرێت. لە نێوان ئەو دوو ناوچەیەدا، ناوچەیەک لە کوردستانی ئێران بەداگیرنەکراوی دەمێنێتەوە. لەم ناوچەیەدا کۆمارێکی کوردی دادەمەزرێت کە هەتا کشانەوەی هێزەکانی ڕووسیا بەردەوام دەبێت. بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە ناو خەڵکیدا باوە، کۆماری کورد دەستکردی ڕووسیا نەبوو.

ئەوە بوو هێزەکانی کۆماری مهاباد بەبێ بەربەرەکانی خۆیان تەسلیمی هێزەکانی ئێران کرد و سەرکۆمار قازی محەممەد و برایەکی و ئامۆزایەکی لە ٣١ی ئاداری ١٩٤٧دا لە گۆڕەپانی چوار چرا لە سێدارە دران. ئەو گۆڕەپانەی کە لە ٢٢ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢دا، بانگی کۆماری کوردی تێدا درا. دوای ڕووخانی کۆمار، هێزەکانی بارزانی لەلایەن هێزەکانی ئێران و عێراقەوە لەسەر سنوور گەمارۆ دران.

برا گەورەکەی مستەفا بارزانی، شێخ ئەحمەد کە هیچ بەرپرسایەتیەکی سەربازی نەبوو، گەڕایەوە بۆ عێراق بەو مەرجەی کە بەشداری لە خەباتی چەکداریدا نەکات بەدژی حکوومەت، هەتا ئێستاش ئەو پەیمانەی نەشکاندووە.

هەرچی مستەفا بارزانییە، پاش هەژدە مانگ ئاوارەیی لە ئێران، ڕێگایەکی سەخت هەڵدەبژێرێ و بەرەو ناوچە شاخاویەکانی بارزان دەڕوات.

ئەو باش لەوە گەیشتبوو کە نایەڵن بەئارامی لە ناوچەکەدا بمێنێتەوە، بۆیە بڕیار دەدات پەنا بەرێتە بەر وڵاتێک کە ژیانی تێیدا پارێزراو بێت.

بارزانی بەسنووری عێراق و تورکیادا بەرەو ڕووسیا دەکەوێتە ڕێگا، بەخۆی و پێنج سەد کەس لە یاوەرانی، بەپێ ڕێگایەکی دووروودرێژی پێنج سەد کیلۆمەتریان بڕی.

بارزانی و هاوەڵەکانی ١١ ساڵ لە سۆڤیەت مانەوە، تا کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم کە کورد بەدڵ و بەگیان پشتیوانییان لێکرد. ئەوە بوو

پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێگای پێ درا کە بەئازادی کاری سیاسی خۆی بکات، گۆڤار و کتێبی کوردی دەرگای وەشانیان بۆ کرایەوە و چیتر وەکو کارێکی قەدەغە چاویان لێ نەدەکرا.

لە یاسای کاتیی عێراقیدا کە لە ١٩٥٨/٦/١٤دا، دارێژرا، عێراق بووە وڵاتی هاوبەشی کورد و عەرەب. کاتێک قاسم دڵنیایی لە بەشە دیکتاتۆریەکەی خۆی بەدەست خست، ڕووی ڕاستەقینەی خۆی بەرانبەر کورد دەرخست. ڕۆژنامەی (الثورة) کە قسەکەری نیمچە ڕەسمی دەوڵەت بوو، دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی کۆمەڵە وتارێک کە بانگەشەی بۆ تواندنەوەی گەلی کورد دەکرد لە ناو گەلی عەرەبدا. ڕۆژنامەکە ڕەخنەی ئاراستەی کەم توانایی ڕژێمەکان دەکرد لە مەڕ توانەوەی گەلی کورد، مەبەست لە بەعەرەبکردنی کورد بوو. ڕۆژنامە کوردییەکان قەدەغەکران و پارتی دیموکراتی کوردستانیش قەدەغەکرا، بارزانی هەستی بە نا دڵنیایی دەکرد لە بەغدا، بۆیە ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی بارزان. لەوێوە داخوازی نامەیەکی ئاراستەی قاسم کرد کە ڕێزی مافە دیموکراتییەکانی گەلی کورد بگرێت. بەڵام ئەوە بوو عێراق بارزانی بەداردەستی ئینگلیز لە قەڵەم دا. چەند سەرکردەیەکی کورد گیران، کار گەیشتە شوێنێک کە چیتر نە دەتوانرا ڕێگا لە هەڵگیرسانی شەڕێکی چەکداری بگیرێت.

لە ڕۆژی ٩ی ئەیلولی ١٩٦١دا هێزەکانی عێراق، هێزەکانی ژەنەراڵ بارزانییان بۆردوومان کرد، کە تەنها حەوت سەد پارچە چەکی کۆنیان پێ بوو. لە ٢٣ی هەمان مانگدا قاسم ڕایگەیاند کە شۆڕشی کوردان خامۆش کراوە و بارزانیشیان کوشتووە. لە ڕاستیدا قاسم گۆڕی بۆ خۆی هەڵدەکەنی بەوەی کە دەیویست بەهێزی چەک کورد بتوێنێتەوە و نابووتیان بکات.

لە ماوەی پازدە مانگدا، ژمارەی چەکدارە کوردە نارێکخراوەکان گەیشتە بیست هەزار کەس. ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرانی کورد ڕیزەکانی سوپای عێراقیان بەجێ هێشت و پەیوەندیان بەژەنەراڵ بارزانییەوە کرد. هێزەکانی

قاسم نەیانتوانی تەنیا سەرکەوتنێکیش بەسەر هێزەکانی کورددا تۆمار بکەن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢دا، ژمارەیەک ئەفسەر کە خۆیان بەئەفسەرانی ئازاد ناوزەد کردبوو، پەیوەندیان بەژەنەراڵ بارزانییەوە کردبوو و، پێیان ڕاگەیاند کە نەیانەوێت قاسم لە دەسەڵات لا بەرن. ژەنەراڵ تەها یەحیا (تاهر یەحیایە)، بارزانی دڵنیاکرد لەوەی کە ئەگەر کودەتاکەیان سەربگرێ، دان بەمافەکانی کورد دا دەنێن لە چوارچێوەی سنوورەکانی عێراقدا.

لە ١٩٦٣/٢/٨دا، کودەتایەکی بەبەرنامەیان لە قاسم کرد. قاسم داوای لە هاوڕێی دێرین و هاوپیشەی چەکداری خۆی عەبدولسەلام عارف کرد کە ژیانی بپارێزێت، هەروەک دەزانرێت عارف بەمەرگ حوکم درابوو بەتاوانی ئاژاوەگێڕی، بەڵام لە لایەن قاسمەوە عەفوو کرابوو. تەنانەت قاسم پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عارفدا هێشتبووەوە و بەبرای خۆی ناوی دەبرد. بەڵام عارف هەمان بەخشندەیی بەرانبەر قاسم نیشان نەدا. بەڵکو لە کاتی پارێزگاری لەخۆکردندا، کوژرا و، لاشە بەگوللە بێژراوەکەیان بەکورسییەکەوە بەستەوە و لە تەلەفزیۆنی عێراقەوە نیشانی خەڵکیان دا.

هەمان کات کە گفتوگۆی نێوان کورد و ئەفسەرانی ئازاد بەردەوام بوو، ئامادەگی بۆ هێرشێکی سەربازی بۆ سەر کورد دەکرا. کوردیان بەوەعد و بەڵێنی ئەوەی کە کێشەکەیان بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەردەکرێت، ئارام کردبووەوە. ڕژێمی سەربازی نوێ چاوەڕوانی وەرزی هاوینیان دەکرد بۆ ئەوەی هەوڵی لە ناوبردنی هێزەکانی بارزانی بدەن. لە ١٩٦٣/٦/٧دا، سێ ڕۆژ پێش ئەوەی کە بەیاننامەیەکی چاوەڕوانکراو لەلایەن کورد و عێراقەوە بڵاوبکرێتەوە، سوپای عێراق هێرشیان کردە سەر جێگاکانی پێشمەرگە. وەفدی کوردی ڕاپەڕی زیندان کران لە کاتێکدا کە بەڵێنی ئەوەیان دابوونێ کە بەهەلیکۆپتەر دەیانگوێزنەوە بۆ بارەگای بارزانی. دەسەڵاتی ڕژێمی عەسکەرتاریەتی تازە، بەدەست ئەو ئەفسەرانەوە بوو کە لایەنگری بزووتنەوەی پان-عەرەبیستی بەعس بوون. کودەتایەکی لەو

جۆرە لە ١٩٦٣/٣/١٠دا لە لایەن بەعسییەکانی سوریاوە کرا. ئەفسەرانی گەنجی دەسەلاتداری ئەو دوو وڵاتە لە دژی کورد یەکیان گرت و لە ١٩٦٣/٦/١٠دا، داوایان لە ژەنەراڵ بارزانی کرد کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا خۆی تەسلیم بکات. لەو کردەوەیەدا، فەیلەقێکی سوپای سوریی بوونە هێزی پشتیوانی شەست هەزار سەرباز لە سوپای عێراقی، هەروەها هێزی هەوایی ئەو دوو وڵاتە کە بەفڕۆکەی مۆدێرن تەیارکرابوون، دەستیان کرد بەهێرشکردنە سەر کورد. ئەو هێرشە بەهێزەی کە پێشتر نەبینرابوو، بۆ سەر هێزەکانی بارزانی، بەتەواوەتی تێک شکا. ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و ژن و پیر بوونە قوربانی لە هێرشەکاندا بۆ سەر کوردستان.

لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا کودەتایەکی چاوەڕوان نەکراو لە بەغدا ڕوویدا. ئەفسەرانی لایەنگری بەعس پاکسازی کران و براکەی عەبدولسەلام عارف بووە پیاوی بەهێزی وڵات. بەعسییەکان پێشتر بەئاشکرا کۆمۆنیستەکانیان پاک کردبووەوە. وا ئێستا خۆشیان لەسەر شانۆ لابران.

بەدوورخستنەوەی کۆمۆنیست و بەعسییەکان، عارف بەناوی ئایینی ئیسلامەوە وەکو ئایینی هاوبەشی هەردووک لا، بانگەوازی کوردی کرد. بەناوی برایەتی گەلانی موسڵمانەوە قورئانێکی بۆ بارزانی نارد، بەبێ ئەوەی باسی داخوازییەکانی کورد بهێنێتە گۆڕێ. ئەم داخوازییە بۆ ئەوە بوو کە کارە نامرۆڤایەتیەکانیان بەدژی کورد، پێ بشارنەوە. لە سێ ساڵ پێش ئێستاوە، ڕژێمی عێراق، بەناپاڵم گوندە کوردییەکانی بۆردومان دەکرد. گوندەکانی لەگەڵ زەوی تەخت دەکرد، بەرووبوومی کوردیان ئاگر تێ بەردەدا، لە هەواوە بۆردومانیان دەکردن و ئاژەڵەکانیان دەکوشتن. ڕژێمی بەغدا، سیاسەتی پاکتاوکردنی بەدژی کورد پیادە کردبوو.

بەرنامەکانی ئەم دواییەیان بۆ لەرەگوڕیشە هەڵکێشانی کورد بەم جۆرە بوو: هێزی گەورەی سوپایی، تەنها تەرکیز بکاتە سەر جێگایەکی دیاریکراو، هەموو گوند و خانووەکان بەناپاڵم بۆردوومان بکرێن،

دانیشتووانەکەی ناچار بکرێن جێگاکانی خۆیان بەجێ بهێڵن. دوای ئەوەش بەشێوەیەکی سیستەماتیک، سوپا گوند لە دوای گوند داگیر بکات و هەرچییەکیان بەردەست کەوت بیسووتێنن.

پارتی دیموکراتی کوردستان، لیستەی ٢٨٦ گوندی لەو گوندانەی کە لەلایەن سوپای عێراقەوە لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکووک و مووسڵ، کاول و وێران کرابوون، ئامادەکردبوو.

لە ناوچە پێدەشتەکاندا، دانیشتووانی کورد ناچار دەکران شوێنەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و ڕووبکەنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و، خێڵە عەرەبە کۆچەرەکانیان لە جێگای کوردەکاندا نیشتەجێ دەکرد.

هیچ کام لەو وڵاتانەی کە چەکیان بەعێراق دەفرۆشت، گوێبیستی داخوازییەکانی کورد نەبوون، کە داوایان دەکرد چەک و تەقەمەنی بەعێراق نەفرۆشن. عەرەبەکان چەکی پێشکەوتوو و کاریگەریان بەدەست خستووە، لەو چەکانەی کە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەکاردەهێنران. چەندین جار کورد داوایان لە نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە، کە با عێراق دەست لە سیاسەتی توانەوەی کورد هەڵبگرێت. بەتایبەتی گەلێک جار ناڕەزایەتیان بەرانبەر ئەوەی کە عێراق چەکی کیمیایی بەدژی ئەو گوندانە کە زیاتر ژن و منداڵ و پیری بێ دیفاعیان لێ دەژیا. لەم دواییانەدا کورد داوایان لە نەتەوەیەکگرتووەکان کردبوو، کە گروپێکی چاودێر بنێرن تا لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر کردەوەکانی ڕژێمی عێراق لە کوردستاندا بکەن. بەڵام تا ئێستا هەوڵی کورد بۆ ڕازی کردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، بێ سوود بووە. تواندنەوە و پاکتاوکردنی نەتەوە غەیرە عەرەبییەکان وەکو "کاروباری ناوخۆی عێراق" چاوی لێدەکرێت.

سەرکۆماری عێراق عەبدولسەلام عارف لە ١٤/٤/١٩٦٦دا لە ڕووداوێکی فڕۆکەدا کوژرا، ئەوە لە کاتێکدا بوو، کە عارف خۆی ئامادە دەکرد بۆ هێرشێکی بەربڵاو بۆ سەر کورد. لە کاتی ڕووداوەکەدا براکەی

عەبدولڕەحمان عارف لە مۆسکۆ سەرگەرمی معامەلەی چەک کڕین بوو. لەوێ پێیان وت کە عێراق دەبێت ئەو پارەیەی بەقەرز لای ماوەتەوە، بداتەوە تا بتوانێت چەکی تر لە سۆڤیەت بکڕێت. ئەو پارەیەش تەنها بەشێک بوو لەو پارانەی کە عێراق بۆ چەک کڕین بەقەرز وەریگرتبوو بۆ تواندنەوەی کورد.

مردنی سەرکۆماری عێراق بووە هۆی دواکەوتنی هێرشی عێراقیەکان بۆ سەر کورد، کە لە چل هەزار سەربازی مۆدێرنی چەکدار کراو پێکهاتبوو. لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەی شەڕدا، تا دەهات کورد لە بەڵێنە درۆکانی عێراقییەکان دڕدۆنگ تر دەبوون. کورد پێیان وابوو کە ئەوان تا ئەو کاتەی لەگەڵ عێراقدا ڕێک دەکەون، بەرخۆدانی خۆیان درێژە پێ بدەن.

ئەگەر ئاشتی نێوان کورد و عێراقیەکان دەستەبەر بکرێت یان نا، دەبێت هەرچی زووترە هاوکاری مرۆڤانە بگەیەنرێتە کورد بۆ ئەوەی کەمێک لە ئازار و مەینەتیەکانی خەڵکی سڤیلی کورد کەم بکرێتەوە.

ستۆکهۆڵم ١٦/٥/١٩٦٦

ئۆلف گ. تاندبیرگی

## بۆ خاچی سووری سوید

ئێمە ئەم ڕێکخراوانەی خوارەوە کە ئیمزامان کردووە و بەهەموومان نوێنیونێکی بەرفراوانمان پێکهێناوە بەبێ گوێدانە بیروڕای سیاسی و خەتی ئایدۆلۆژی، دەمانەوێت بەم نامەیە داوا لە خاچی سووری سویدی بکەین کە دەست بکات بەهەڵمەتێکی سویدی بۆ کێشەی کورد.

هەروەک دەزانرێت دەوڵەتی عێراقی نوێ لە سێ ولایەتی: مووسڵ و بەسرە و بەغدای سەر بەئیمپراتۆریەتی عوسمانی پێکهاتووە. ناوچەکانی سەرووی بەغدا کە بەکوردستان ناسراوە و زۆرینەی دانیشتووانی کوردن. ناوچەی خوارووی عێراق بەمیسۆپۆتامیا ناسراوە، دیارە مەبەست لەو ناوچەیەیە کە دانیشتووانەکەی عەرەبن. ئەم ناوچەیە بەماوەیەکی کەم پێش کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی لەلایەن بەریتانیەکانەوە داگیرکرا. لە پەیمانی ئاشتی سیڤەردا لە ساڵی ۱۹۲۰، کە کورد لەلایەن شەریف پاشاوە نوێنەرایەتی دەکران، دان نرا بەسەربەخۆیی کورددا لەو ناوچانەی کە زۆرینە پێکدەهێنن. (سەرچاوەی ئەم زانیاریانە کۆمیتەی کوردی- سویدییە).

هەروەک دەزانرێت دەوڵەتی عێراق لە ۱۹٤٥/۱۲/۲۱ دا بووەتە ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکان، بەو شێوەیە عێراق بەبێ هیچ دوودڵییەک پەیمانەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانی قبووڵ کردووە. هەروەها لە ۱۱ کانوونی یەکەمی ۱۹٤٦ دا عێراق بەشداری بڕیاری نەتەوەیەکگرتووەکانی کرد کە تیادا کۆکوژی گەلان وەکو تاوانێک لە یاسا نێونەتەوەییەکاندا چاوی لێ دەکرێت و لەلایەن جیهانی شارستانییەوە بەنەحلەت دەکرێت. لە پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بەم جۆرە پێناسەی گەلکوژی کراوە (کە یەکدەنگ لەلایەن ئەندامانی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە لە ۹ کانوونی یەکەمی ۱۹٤٨دا پەژرێندراوە) «ئەنجامدانی هەموو کردەوەیەک کە بەمەبەست یان بەزانایییەوە بۆ تێکوپێکدانی لایەنێک، نەتەوەیەک، گرووپێکی ئیتنیکی، نەژادی، یانیش دینی و بەو شێوەیە». کورد

رووبەڕووی ئەو کۆمەڵکوژییە بوونەتەوە کە نەتەوەیەکگرتووەکان پێناسەیان بۆ کردووە، بۆیە ئێمە داوا دەکەین کە:

- ڕێکخراوی خاچی سووری سویدی پێشنیاز بەخاچی سووری نێونەتەوەیی بکات تا کۆمیتەیەک دیاری بکرێت تا لە ڕەوشی خراپی خەڵکی سڤیلی کوردستانی عێراق بکۆڵدرێتەوە. داواکردنی ناردنی کۆمیتەیەک بۆ عێراق، لەگەڵ ئەو پەیمانەی خاچی سووری نێونەتەوەیی یەکدەگرێتەوە کە بۆ یەمەن کرا لە ساڵی ١٩٦٣دا. بە لەبەرچاوگرتنی هێرشەکانی سوپای عێراق لە کوردستاندا، خەڵکی سڤیلی کورد کەوتوونەتە ڕەوشێکی واوە کە دووچاری پاکتاوی ڕەگەزی بوونەتەوە، بۆیە ئێمە داوا دەکەین کە هەرچی زووترە ئەو وەفدە بنێردرێتە کوردستان تا لە ڕەوشی کورد بکۆڵێتەوە.

- خاچی سووری سویدی لە ڕێگای خاچی سووری نێونەتەوەییەوە لەگەڵ مانگی سووری سوریی و تورکی و ئێرانی و عێراقی، بکەونە هاوکاریەوە بۆ ئەوەی بتوانن هاوکاری کورد بکەن و لە ئازاریان کەم بکەنەوە.

- بە هاوکاری مانگی سووری تورکی و ئێرانی، بتوانرێت خەستەخانە و جێگا بۆ پەناهەندەکان دابین بکرێت، بەتایبەتی بۆ منداڵ و ژنان و پیرو پەککەوتووەکان.

- داوا بکرێت کە دەسەلاتدارانی ئێرانی و تورکی، ڕێگا بەهاوکارییە مرۆڤییەکان بدەن لە خاکی ئەو وڵاتانەوە بگەیەنرێتە کورد. خاچی سووری سویدی بەهاوکاری ئەو ڕێکخراوانەی کە دەیانەوێت، کۆمپانیایەک بخەنە ڕێ بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری لە سوید هەروەک ئەوەی کە بۆ جەزائیری و مەغریبی و یۆنانی و... هتد کرا.

١٩٦٦/٥/١٦

زیاتر لە پەنجا ڕێکخراوی کرێکاران، مامۆستایان، قوتابیان و لاوان وئایینی و مافی مرۆڤ و پیشەییەکان، ئەم بانگەوازەیان ئیمزا کردووە. هەمان بانگەواز ئاراستەی بەرپرسی کاروباری دەرەوەی سوید تۆرستین نیلسۆن، کراوە.

## دوا وشە

کاتێک ئەم دێڕانە دەنووسم، بۆ ماوەیەکی کاتی لە کوردستاندا تەقە وەستێنراوە. بەشێوەیەکی سەرەکی هێزەکانی ڕژێم لە لوتکەی شاخە بەناپاڵم سووتێنراوەکان، خۆیان کێشاوەتەوە. لێرە و لەوێ دەنگی تەقە دەبیسترێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بێدەنگی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە.

خەڵکی شپرزەی سڤیلی کورد، تەنها بیر لەیەک شت دەکەنەوە ئەویش ئەوەیە کە بژین. لەو شوێنانەی کە بتوانرێت خەریکی ناوەدانکردنەوە و دروستکردنەوەی خانووەکانن، بەڵام وەکو پێویست هیچ شتێک دەست ناکەوێت، کەرەستەی خانوو دروستکردن، جلوبەرگ و خۆراک. ئێستا خوێندنگاکان داخراون و ئەو کەمە خەستەخانانەی کە ماون، داوودەرمان و کەرەستەی پێویستیان نییە. مرۆڤ دەتوانیت بەچاوی خۆی ئەم شتانە ببینێت، ئەگەر چەند سەعاتێک بەفرۆکە سەفەر بکەیت.

ئەمە ئەو هۆیانەیە کە پاڵی بەکۆمیتەی سوێدی - کوردییەوە ناوە تا ئەم ڕاپۆرتە ئامادە بکات کە لە ١٩٦٦/٣/٢٨دا دامەزراوە.

لە پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمیتەکەدا هاتووە، کە ئەم کۆمیتەیە سەر بەهیچ ڕێکخراوێکی سیاسی یان ئایینی نییە، بەڵکو لەلایەن ڕێکخراوە سوێدی و خەڵکانی سەربەخۆوە بنیات نراوە. کاری سەرەکی ئەم کۆمیتەیە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە «لێکۆڵینەوە کردن لەسەر ئەوەی کە بەچ شێوەیەک کورد دووچاری کۆمەڵکوژی بوونەتەوە یان دەبنەوە. کۆمیتەکە بەگوێرەی بنەماکانی نەتەوەیەکگرتووەکان هەڵسوکەوت دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی بێ لایەنانە کارەکانی ئەنجام بدات».

دەبێت دوو خاڵ دەستنیشان بکرێن. یەکەمیان: هەر لە سەرەتای دروستبوونی کۆمیتەکەوە لەلایەن خەڵکانی سەربەخۆ و ڕێکخراوەکانەوە

پشتیوانی لێکراوە، بەتایبەتیش لاوان و ڕێکخراوی لاوان دەیانەوێت چالاکانە هاوکاری و بەشداری لە کەمکردنەوەی ئازارەکانی خەڵکی سڤیلی کورددا بکەن.

دووەمیش: کۆمیتەکە دەیەوێت لە چوارچێوەیەکی مرۆڤانەدا کارەکانی خۆی بەرەوپێش بەرێت و نەیانخاتە قاڵبێکی سیاسییەوە. ئەمەش لەلایەن نوێنەرانی کۆمیتەکەوە بەئاشکرا لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ سەفارەتی عێراقی لە ستۆکهۆڵم و نوێنەرانی پەروەردەی عێراقی لە پاریس، باس کراوە. هەر بۆیە نابێت کارەکانی کۆمیتەکە وەکو هێرش بۆسەر دەوڵەتێک یانیش کلتووری عەرەب چاوی لێ بکرێت. بەپێچەوانەوە، لە بەڕێوەبەرایەتی کۆمیتەکەدا، خەڵکانێک هەن کە تاقیکردنەوەیان لەناو ژیانی عەرەبدا هەیە و دەزانن مەبەست لە کلتووری عەرەب لە جیهاندا چییە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم خاڵانەدایە کە کۆمیتەکە ئەم ڕاپۆرتەی ئامادەکردووە و ڕاشکاوانە ئەوەی نیشان داوە کە لێک تێگەیشتن و سەبر کە چەند سەدەیەک باڵی بەسەر دنیای موسڵمانێتیدا کێشاوە، هێشتا ئەو هێز و توانایەی تێدا شک دەبرێت کە چالاکانە لە هەوڵی چارسەری کێشەی کورددا بێت لە کوردستاندا.

ستۆکهۆڵم، کانوونی دووەمی ١٩٦٧

کۆمیتەی بەڕێوەبەری کۆمیتەی کوردی- سویدی

مەبەست لە کۆمەڵکوژی "جینۆساید" ئەوەیە کە «زنجیرە کردەوەیەک بەشێوەی سەرەکی یان ناسەرەکی هەوڵی لەناوبردنی کۆمەڵە خەڵکێک بدرێت بەهۆی جیاوازی نەتەوەیی، نەژادی یان ئایینی". ئەم پێناسەیە لە پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیراوە کە بۆ مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ. ئەم خاڵە لە ئەنجومەنی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بڕیاری لەسەر درا لە ٩ کانوونی یەکەمی ١٩٤٨دا و لە ١٢ کانوونی ١٩٥١دا خرایە خانەی جێبەجێکردنەوە. ئەم پەیماننامەیە لەسەری دەڕوات و دەڵێت: «کۆمەڵکوژی تاوانە و دەبێت سزا بدرێت، هەوڵدان بۆ کۆمەڵکوژی، ڕێگاخۆشکردن بۆ کۆمەڵکوژی، بەشداریکردن بەمەبەستێکی وا. ڕژێمەکان دەبێت دەستەبەری پێداویستییەکانی یاسایی بکەن و چالاکانە بۆ دادگایی کردنی سەرۆکانی دەوڵەتان، کارمەندانی دەوڵەت و خەڵکانی شەخسی، تێبکۆشن. دەبێت ئەوانەی بەم تاوانە هەڵدەستن، لە دادگایەکی ئەو وڵاتەی کە تاوانەکی تێدا کراوە یان لە دادگایەکی نێودەوڵەتیدا دادگایی بکرێن و سزا بدرێن».

# پێڕست

عەبدوڵڵا ئاغا پشدەری لە ناوەڕاستی هەڤاڵە پێشمەرگەکانیدا

